# کاروان

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری مانگانەیە

ئەمینداریتیی گشتیی ڕۆشنبیریو
لاوان بە زمانی کوردیو عەرەبی
دەری دەکا

سەرنوسەر
محمد أمين محمد احمد

جێگری سەرنووسەر
حسين رشواني

٧٢
شوباتی/ ١٩٨٩
ساڵی حەوتەم

ئەدەرس
هەولێر ئەمینداریتیی
گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان
گۆڤاری «کاروان» ت ٢٠٨٠٠

نرخی (    ) فلسە

## لەم ژمارەیەدا



لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە «٤٨٣»ی ساڵی «١٩٨٢»ی دراوەتێ

لە چاپخانەی (الاديب البغدادية) چاپکراوە

# ئۆپەرێتی
# نیشتمانی خۆم خۆش دەوێت

صدیق شێخ محمود بەرزنجی

٧ / ٣ / ١٩٨٥

وتـو ویژێکی نێوان ئەندامانی خێزانێکی نیشتمان پەروەر بە شێوەی ئۆپەرێت دەربارەی رادەی خۆشەویستیی نیشتمان و سنــووری لێ بوردن و گیــانی خۆبــەخت کردن لە پێنــاوی پاراستنیدا لەو دوژمنەی دەست بۆ داگیرکردنی درێژ دەکات .



ئەندامانی خێزانەکە:

ئاراز : باووك .
نیاز : دایك .
سەنگەر : کوڕی گەورە .
سنوور : کوڕی ناوەنجی .
ڕێباز : کوڕی بچووك .
گلنیلو : کچی بچووك .

لە دانیشتنێکی خێــزانیــدا باووك دەربــارەی باری ئاڵۆزی نیشتمــان و دیاری کردنی هەڵوێستی خۆیان ئامۆژگاری یان ئەداتێ و دەڵێت :

**باووك** :ڕۆڵە کوڕەکان ، کیژە جوانەکەم
ئادەی گوێ گرن لە داستانەکەم
ئەڵێن پاشایەك حەوت کوڕی هەبوو
لە مەیدانا هێز لەو زیاتر نەبوو
بەرەو کۆتایی تەمەنی پاشا
هەنگاوی دەناو پێی لێ هەڵکێشا
هەریەك لەوانە بۆ جێگەی باوکیان
نەخشەی دەکێشا شەو تاکو بەیان
ئاژاوە کەوتە نێو ئەو کوڕانە
بوون بەمەخسەرەو پەندی زەمانە
بۆ کورسی و پارە دژوار بوونەوە
دەستەو یەخە بوون لێك جیابوونەوە
پاشا ئەم کارەی زۆر لا گران بوو
تەخت و ژیانی خۆی لا بێزار بوو

پێی ووتن ئەگەر یەك نەگرنەوە
گرەو لە دوژمن قەت نابەنەوە
بێنە قەڵەمێك بیخە نێو پەنجان
دەستی لێ توند کەی دەشکێ بە ئاسان
بەڵام حەوت قەڵەم کە پێکۆ بەستران
هێز نایشکێنێ وا سووك و ئاسان
گەر ئێوەش یەك بن یەك بیرو بروا
سامان و ووڵات لە دەستتان ناروا .

**دایك** :ئەو پەندەی بابە بۆی گێڕانەوە
گەر ژێر بن تا سەر لێك جیا نابنەوە
دوژمنەکەمان بەتەمای خاکە
خوێن ڕێژە ئێجگار سفڵەو ناپاکە
هیچ چاکەیەکی لەبەر چاو نی‌یە
نمەك دەمیگری ئەو خومەینی‌یە

**سەنگەر** :با هەر دوژمن بێ و پیس و ناپاك بێ
وەك گورگی برسی چاوی لەلاك بێ
ئێمەی چەك بەشان ڕۆڵەی ئەم خاکەین
پێشەنگین ئازاین لە مەرگ سڵ ناکەین
هەر چاو چنۆکێ سنوورمان ببڕێ
نووکی نێزەمان وورگی دا ئەدڕێ
دەیکەین بە گۆڕی ئەم کوردستانە
ئەبێت بە پەندی ڕۆژو زەمانە

**سنوور** :ئەی کاکە ئێوە حیسابێك بۆ ئێمە ناکەن ؟ !

**سەنگەر** :ئێوە ... ؟! ئێوە چین .. ؟! هێشتا منداڵن ؟!

**سنوور** : **نەء** :من سەربازی نیشتمانم
بەختی ئەکەم روح و گیانم
بۆ ئەم خاکە تێ دەکۆشم
بەهیچ شتێك نایفرۆشم

پارەو کورسی و کۆشکی جوان
ناگرێ جێی سۆزی نیشتمان
ئەوەی خاکی خۆی دەفرۆشێ
سزای تاوانی دەنۆشێ

**باووك** :ڕۆڵەی شیرین نازدارەکەم
نەك تۆ منیش گیان بەخت دەکەم
هەر چەندە جەرگ زۆر شیرینە
مایەی ژینی دنیاو دینە
بەڵام بستێ ئالەم خاکە ..
ئالەم ئاوو هەوا پاکە
کەوا پێی دەڵێن نیشتمان
لە جەرگ شیرینترە لامان
بۆیە بێ سڵ لێ کردنەوە
لەناو کوورەی دەروونەوە

**ئەڵێم ، ئەڵێم** :هەر چیم هەیە بۆی بەخت دەکەم
تاسەر بەدوژمن شۆر دەکەم

**دایك** :هەر چەند ئێوە شەهید کرێن
ئەو ئازارە پشت دەشکێنێ
بەڵام ئازاری نیشتمان داگیر کری ؟!!
هەی هەی .. ئەوە ئاگرێکەو گر ئەسێنێ
تۆیش و منو هەر هەموومان
تۆیش و منو هەر هەموومان
دەستە چیلکەی ئەو ئاگرەین
تاهێڵە هێڵ گر بسێنێ
کڵپەی بگاتە ئاسمان
خۆشی ئەکەین تاو بسێنێ ..
تا داگیر کەر بسووتێنێ ..

**ڕێباز** : دایە .. دایە ...
**دایك** :گیانی دایە ..

**رێباز** :قەسەم ئابەم خاکە جوانە(مستێ خۆڵ لە زەوی هەڵدەگرێ)
بەو شاخە بەرزو سەختانە
بەو بەفرو خوێنەی تێکەڵ بوو
بەو گیانەی بۆ خاك شەهید بوو
بەو سەنگەرەی تیایدا جەنگان
بۆ پاراستنی نیشتمان
هەتا تاقە کوردێ مابێ
چنگی لە خاکم گیر نابێ .

**سنوور** :چونکە ئێمەش هەمان رۆڵەین
تینووی خوێن رەشتنی تۆڵەین
لەو دوژمنەی هێرش دێنێ
خاك داگیرکاو لێم بستێنێ
با خومەینی و رەفسنجانی
خۆی و سوپاو پاسدارانی
هێرش بێنن بۆ سنوورمان
تا بیکەینە گورستانیا ن

**کانیاو** :دایە گیان ..وا دەزانن من کچم و بێ دەسەلاتم و هیچم لە دەست نایەت ؟!

**دایك** :رۆڵە گیان کیژە جوانەکەم .. چیمان بۆ دەکەیت..؟!
**کانیاو** :دایکە منیش وەك براکان
دەبمە پیشەنگی نیشتمان
خاك لە دوژمن دەپارێزم
ناترسم خاوەنی هێزم
گەل و سوپا دلێرەکەم
جەنگاوەرن بۆ خاکەکەم

**منیش** :ئەو بروایەم بە تینەوە
لە لولە تۆپی قینەوە
دەیگرمە کەللەی دوژمنم
دەیخەمە گریەو شینەوە
سنووری خاکم پۆلایە
قەلای مەردەو ، شێری تیایە
هەر کەسێ پەنجەی بۆ بێنێ
تاپشتاو پشتی نامێنێ
ئێمەی لاو رۆڵەی وولاتین
کچ و کور بۆ مەرگ وا هاتین
ئەیپارێزین خاکەکەمان
یا سەرکەوتن یا نەمانمان

**باووك** :من کە رۆڵەی وەك ئێوەم بێ
یەك هێزبێ و بروای بە خۆی بێ
تێکرا هەر هەموو خێزانێ
مانای یەك بوون چاك بزانێ
نەیدا بە کورسی یان پارە ..!
رۆژی سەرکەوتنمان دیارە .

**سەنگەر** :ئێ بابە گیان ... قسەکانت گەوهەرن ... زۆر خۆش و بەسوودن .. چی تریش هەیە بۆمان بلێ ...

**باووك** :رۆڵە گیان .. هەموو باوکێك ئەبێ ئامۆژگاری رۆڵەکانی خۆی بکات و بێ خەم بەرەلای نەکات و :
بەگوێی رۆڵەی دا بخوێنێ
مل بۆ دوژمن نەنەوێنێ
یەك مەبەست و هیواو هۆشبن
بۆ یەکتر بەکوڵ و جۆشبن
بروای یەکتر نەدۆڕێنن
تا خاکتان لێ نەفرێنن
باهەر هەموو خێزانەکان
لە بصرە تاکو کوردستان
شوورەی پۆلای ئەم خاکە بن
دۆستی رێبازی چاکە بن .



خزمەتگوزارانی کورد

**دڵشاد مەریوانی**

# وەفایێک بۆ یادەوەری

# مەلا جەلالی مەلا ئەحمەدی نەقشبەندی

لە شاری سلێمانی سێ خانەقا هەیە. یەکێك لەوانە پێی دەڵێن: خانەقای حاجی مەلا عەلی. بنیاتنانی ئەم خانەقایەو ڕۆڵی لە پەروەردەدادانی فەقێیانو بوونی بە مەڵبەندێکی زانیاری ئایینیو بەڕێوە- بردنی لەلایەن وەچەکانی بابە تاهیری هەمەدانی (عوریان) چیرۆکێکی سەربەخۆی دەوێ، کە بە شەجەرە ناوی هەموویان نووسراوە تیایداو بنەماڵە یەك لە دووای یەکەکانیان پاراستوویانە، کە ئیستا لای دووا بەتەمنیانە کە ئەویش مەلا کەمالی مەلا ئەحمەدی نەقشبەندییە.

بنیاتنەری خانەقاکەش مەلا وەسمانی شاعیر بووە، کە لە حەفتاکاندا دوکتۆر ئەمینی موتابچی دیوانەکەی ساغ کردەوەو بە چاپی گەیاند.

ئەو سەرەتا کەمە بۆ ئەم ووتارە بەسە، تا خوێنەرانی ئازیز ئەلفو بێیەکیان دەربارەی باسەکە بێ.

مەلا جەلالی مەلا ئەحمەدی مەلا صاڵحی نەقشبەندی. یەکێك بوو لەو مەلا هوشیارو بیر ڕۆشنانەی بێدەنگ - وەك زۆربەی زۆری ڕووناکبیرانی ئەم بنەماڵەیە - ڕۆژگارانی تەمەنی خۆی بۆ زانیاری ئایینیو ڕۆشنبیریو ئەدەبو تەرجەمەو ساغکردنەوەی دیوانی شاعیران ڕابوردووومانو پاکنووسکردنیان تەرخان کردبوو.

زانایێکی بە ئارامو قسە خۆشو لەسەرخۆو بیرتیژ بوو. حەزی بە تێکەڵی خەڵك نەدەکرد بەڵام دەرگای ماڵو خانەقاکەی هەموو دەم ئاوەڵا بوو میوانانی ناسیاوو نەناسیاو. ماڵی دنیای بەلاوە هیچ بوو. دەستبڵاوو کەمتەرخەم بوو بەرامبەر بە چورتمە ژیانێکان.

ساکارو بەسەلیقە بوو، لەمەرگ نەدەترساو لە هەڵسو کەوتی ڕۆژانەو ژیانیانەدا زۆر پێشکەوتنخواز بوو. ئەوانەی دەیانناسی ئەم ڕاستیە دەزانن و ئەوانەش کە کچیان داوە بە کورانی ؛ یان کورانیان کچی ئەمیان هێناوە - چونکە ئەم خاڵە لای پێزانی خۆی بۆ زاناو مەلایێکی وەك ئەو بە ڕووناکیو خێرخوازی دەنووسرێ.

دیوانی مەلا وەسمانو هەردوو بەرگی دیوانی خادیمو دیوانی حەمدیو گەلێك دەستنوسسی تر - پاش ئەوەی ئەرکی کۆکردنەوەو پاك نووسیو ڕێکخستنیانی کێشاوە - لە لایەن ئەمەوە پێشکەش بە مامۆستایانو شارەزایانی بە چاپ گەیێنەریان کراوە ؛ بە بێ ئەوەی داوای پاداشتی ڕەنجی خۆی لە کەس بکاو ئامادەش بێ وەریگرێ.

بە هۆی ئەو پەیوەندیو خرمایەتییەی لە نێوان منو ئەو زاتەدا هەبوو - هەزاران نوور لە مەزاری - هاتو چۆیم دەکردو ئاگاداری ئەوەی هەم کە ئەرشیفێکی زۆر نایابی هەبوو لە کتێبو دەستنووسی دانسقەو دەگمەن. لەوانە دەستنووسیان تیادایە لای کەس نەبوون ئەو نەبێ.

ڕۆژێك چوومە خزمەتی فەرمووی: تۆ دەزانی دایکی نادر شا چیرۆك نووس بووە؟

خوا عافوویکا چونکە بە قسە خۆشیو گاڵتە بازییێکی پڕ نەزاکەت ناسرابوو. وامزانی گاڵتەم لەگەڵ دەکا. حاڵی بوو کە من دوودڵم دەستی برد دەفتەرێکی دایە دەستم بە خەتێکی وورد. مەرەکەبێکی جوان، کوردییێکی ڕەوان گۆڕیبوویە سەر زمانی کوردی. ئینجا فەرمووی :- ئەم چیرۆکە بەشی دووەمی داستانی ئەمیر ئەرسەلانە. دایکی نادر شا دایناوەو

منیش ساڵی (١٩٤٩) کردوومەتە کوردی هەڵبەتە ئەوەش چیرۆکی خۆی هەیەو لەگەڵ دوو دەستنووسی دانسقەی تردا پێشکەشی کردمو لە جێی خۆیدا ؛ لێیان دەدوێمو لە هەلی خۆیدا بە چاپیان دەگەیێنم.

کۆششی فەرهادانەو بەخششی جوانمەردانەی ئەو زانا ئەدیبو شاعیرو پێشکەوتنخوازە ، تا دەهات زیاتر هۆگری خۆی دەکردم . تا ڕۆژێك ڕووی ئەوەم لێنا کە یان چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەگەریانەی لەگەڵ بکەم . یاوەکو باسی مێژووی ژیانی خۆیم بۆ بکا . بەرامبەر بەم ڕوولێنانە تۆزێك ڕاما ، پاشان فەرمووی :
– تۆ دەزانی من تۆم خۆش دەوێو بە برازای خۆمت دادەنێم . ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا ، داوای لێبوردنت لێدەکەم چونکە خوا خوامە کەس ناوم نەهێنێ بەڵام شتێکی ترت لەگەڵ دەکەم . ووتم : فەرموو.

فەرمووی : ئەوە دوو ساڵە بە نامەخانەو ئەرشیفەکەمدا دەچمەوە . بەتایبەتی دەستنووسو شیعرەکانی باوکم . پاشان دیوانەکەی خۆم بۆ پێشەکی دیوانەکەم شیعرێکم بەدەستەوەیە ، باسی ژیانی خۆمەو بەراورد کردنێتی بە کارەساتو ڕووداوەکانی ئەم چەرخی بیستەمە نەگریسە لەبەر ئەوە مۆڵەتم بدە تا تەواوی دەکەم ، ئەوسا ئەو شیعرەی ژین‌نامەیەی خۆمت دەدەمێ .. ئیتر پێویستت بەخۆم نابێ.

هەر چاك بوو ماڵی ئاواو مەزاری ڕۆشن بێ ؛ بێ هیوای نەکردم بەڵام بەداخەوە دووای ئەوە کۆچی کردو کتو پڕ لە ڕۆژێکی تۆفو زریاندا بەجێی هێشتین ، لە دووا ساتەکانی کۆچیدا ئەزیێتی کەسی نەدا خۆی چووبووە گەرماو پاش خۆشتنو هاتنە دەرەوە گیانی سپاردو
ماڵەکەیان شان بەشانی خانەقاکەیان بوو ، هەر لەوێ بەرێیان کردو لە تەنیشت کەسو کارو باوکو باپیرانی بنەماڵە پیرۆزەکەی هەر لە مەزاری ئەوان لەناو خانەقادا ماڵئاوایان لێ‌کرد.

دووای ئەو کۆچە کتو پڕەی حاڵی بووم کە شیعرەکەی بۆ ژیاننامەی خۆی تەواو کردبوو بەڵام بەداخەوە یەکێك لە لاپەرەکانی لەناو دەستنووسی تردا بزر بوو یازدە بەیتی لەسەر نووسراوە بەڵکو لە فرسەتو هەلێکدا ئەو لاپەرەیەش بدۆزمەوەو لە دیداری تردا پێشکەشی خوێنەرانی بکەم . ئەوا وەکو وەفایێك بۆ ئەو زاتە پیرۆزە شیعری ژیننامەکەی پێشکەش دەکەم کە یازدە بەیتی کەمە.

**ژیننامەی خۆم**

بۆ تۆ ژیانو بەسەرهاتی خۆم
واخۆم دەینووسم ، نزیکە بڕۆم
نیوەڕۆی جومعە ، عارفەی ڕەمەزان
هاتمە دنیاوە ، ناو نرام : ئینسان
ساڵی هەزارو سێسەدو سیو دوو
هاتمە دنیاوە ، کەوتمە جوستو جوو[1]
نۆسەدو سیازدە ؛ هەزار بە دوواوە
لە مانگی ئابدا . هاتمە دنیاوە[2]
حەربی عالەمی یەکەم دەستپێکرا
من دوازدە مانگك بووم ، شیرم پێ دەدرا[3]
کە (ڕوژ) بە ڕەشی ، لە عالەم گیرا
ساڵەوەختە بووم ؛ ڕەش‌بگیر کرا[4]
سێ ساڵ بووم کە (ڕووس) هاتە (شیوەکەڵ)
ماڵیان باریکرد بۆ لادێی چەپەڵ[5]
چوار ساڵ بووم (قاتی) ڕوویکردە وواڵات
حکوومەتی (تورك) ڕوویکردە نەهات[6]
لە پاش گرانیو دەردو ئێشی پیس
ووڵاتمان کەوتە ژێر دەستی ئینگلیس[7]
جا ئاوەدانی ڕوویکردە ناوشار
خەڵك بووژایەوەو کەوتنە ئیشو کار
شەش ساڵانە بووم ؛ شێخ (مەحموود) برا
بە دەستی ئینگلیس کە ئەسیر کرا[8]
لەپاش شەڕێکی گەورەی خوێن‌ڕژان
لەناو (دەربەند) داو (بەردە قارەمان)[9]
هەشت ساڵ بووم کە شێخ کرا بە پاشا
نەگبەتی کورد بوو ، کە هات بە پاشا
جالەو کاتەدا چوومە بەر خوێندن
کەوتمە ناو داوی (ئەلفو بێ) ووتن
لە خزمەت (مەلا نەجیم یەك شەوە)

یەکەم دەرسم خوێند ، کەوتمە بەندەوە.
ئیتر بە باشی ڕووم‌کردە خوێندن
بە باشی دەمخوێند ، بە بێ سرەوتن
کە گەیشتمە «ئیزهار» بە تێگەشتنەوە
دەستم‌کرد ئیتر بە دەرس‌ووتنەوە
ئیتر مەژغوولْ بووم .. بە خوێندنەوە(۱۰)
تا کەوتمە سەوادی ماڵو ژنەوە
ساڵی چلو یەك ، لە یەکی یەکا
ژنم گواستەوە ، لە سەوی یەکا
لە پێنجی پێنجا ، هەر ئەو ساڵە بوو
کە شەڕی (ڕەشید عالی) پەیدا بوو
لە غەیری خوێندنو ... موتاڵا کردن
هیچم نەکردو نایکەم تا مردن
بە بوونو نەبوون ، بە خۆشیو تاڵی
تەواو ڕازی بووم ، هەر بە منداڵی.

**سەرنج :**

شاعیر لێرەدا لە هەشت ساڵانیەوە یەکسەر ، باسی تا تەواوکردنی خوێندنی دەکا . پاشان دەگەڕێتەوە لای نۆ ساڵانیو دەست پێ دەکاتەوە.

نۆ ساڵانە بووم بۆردومان کرا
تا وەکو چوار ساڵ ، درێژەی پێدرا
بوردومان کرا ، ڕۆژێك تا ئێوار
کووچەو کۆڵانو بازارو ناوشار
سبەینێش تاکو ، کاتی نیوەڕۆ
هەر بۆردومان بوو ، تاڵانو برۆ
(کەمال)ی برام لەو ساڵەدا بوو
لە دێی (میرباسی) سەروو ، نا خواروو(۱۱)
ئە مجا کەوتینە ژێر دەستی غەزەب
خوادا لێی گرتین ، قارو هەم غەزەب
شەڕی بەردەڕکی سەرا ، کە کرا
من هەژدە ساڵ بووم ، ئەو ساتەی کرا
عیراق کە گۆڕرا ، بوو بە جەمهووری
چلو پێنج ساڵ بوم ، زەمانی (نووری)(۱۲)

(ئەو یازدە بەیتە وون بووە لێرەدایە)

..........

شەستو شەش ساڵم ، ئێستا کە ماوم
هێزم نەماوەو کز بووە چاوم.

**پەراوێزە پێویستەکان**

(۱) ، (۲) : ساڵی ۱۳۳۲ ك ، بەرامبەر ساڵی ۱۹۱۳ ز مانگی ئاب ساڵی لەدایك بوونی شاعیرە.

(۳) ، (٤) : ساڵی ۱۹۱٤ ئەمانە بوون ، بانگەوازی شەڕی جیهانی یەکەم ، ڕۆژگیران ، ڕەشبگیرو خەڵکی چەکدارکردن.

(۵) : هێرشی سوپای ڕووس بۆ سەر عوسمانلییەکان داگیرکردنی ناوچەی سلێمانی لەلایەن ڕووسەوە تا گەیشتنە گوندی (شیوەکەڵ) ساڵی ۱۹۱٦.

(٦) : نەخۆش کەوتنی عوسمانلییەکانو پەیدا بوونی قاتو قڕیو گرانیو گۆشتی تۆپیو خواردن ۱۹۱۷ - ۱۹۱۸.

(۷) : بەکەوتنی دەوڵەتی عوسمانلی ئینگلیز عێراقی خستە ژێر دەست

(۸) ، (۹) : شەڕی دەربەندی بازیانو بە دیل گیرانی شێخ مەحموود لای بەردە قارەمانی دەربەند ساڵی ۱۹۱۹.

(۱۰) : مەبەستی موتاڵا کردنە ، نەك دەرسو دەور خوێندن

(۱۱) : مەبەستی مەلا کەمالی مەلا ئەحمەدی برایەتی ، کە ئەو سێ برایە - جەمالو جەلالوکەمال ئەمەن دژێرو بێ وەی بێ تەنیا ئەمیان ماوە.

(۱۲) مەبەستی سەرۆك وەزیرانی حکوومەتی پاشایەتیە نووری سەعید ١٤ ی تەمووزی ۱۹۵۸ ڕژێمەکەی گۆڕرا.

# بەزەیی‌یەك بە زاراوەكانی بە كوردی خوێندندا

فؤاد عزت مصطفی

لە ساڵی ١٩٨٦ دا : بەڕێوەبەرێتی گشتی‌ی بە كوردی خوێندن داوای لێ كردین كتێبی زمیندەوەرزانی پۆلی شەشەمی زانستیٚ وەرگێڕینە سەرزمانی پیرۆزی كوردی ، ئێمەش دڵسۆزانە كەوتینە خۆمان و بەپێی توانا و پشت بەستن بەو گەنجینە زاراوانەی كتێبەكانی رابوردوو دارشتنی زاراوەی گونجاوو لە باری نوێ ؛ كتێبەكەمان وەرگێڕاو لە كاتی خۆیدا سپاردمانەوە بە بەڕێوەبەرێتی ناوبراو بەو هیوایەی بێدەستكاری‌و شێواندن و بەوپەڕی ئەمانەتی زانستی‌یەوە چاپ دەكرێت و دەكەوێتە بەردەست قوتابی‌و ماموستایانی نەتەوەكەمان و ئاسوودە بوین بەوەی راژەیەكی بچكۆلانەی بەكوردی خوێندنمان كردووەو بەردێكی ترمان ناوەتە سەربناغەی ئەو بینا بەشكۆو پیرۆزە ، بەڵام بەداخەوە كاتێ كتێب چاپ كرا ئاسوودەیی رەوی‌یەوەو دەریایەك داخ و گلەیی‌و واق وورمان شوێنیان گرتەوە بەوەی سەروگوێلاك شكێنراوو كەوتە بەردەست خوێنەرانی‌و ئێمەشی رووزەردی (بەكوردی خوێندن) كرد ، سائیتر لە نەزانی‌و هەست بە بەرپرسیاری نەكردن و بایەخ نەدان بە گرنگی مەسەلەكەوە بێ یان لەئەنجامی لەخۆ بایی بوون و سووك روانینە كتێبەكەو وەرگێڕانیەوە بێ ..! كاكی سەرپەرشتیاری چاپ كردنی كتێبەكە (ماموستا عثمان علی قادر) : بە ئارەزووی خۆی شەلم كوێرم ناپارێزم كەوتۆتە گیانی كتێبە داماوەكەو بێ‌هەست و بەزەیی‌یانەو بێ‌ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی كە نە ئەوو نەكەسی تریش مافی ئەوەیان نیە بەموو دەستكاری‌و شەن و كەوی هیچ كتێبێك بكەوێ و كوێرانە زاراوە بگۆڕن و هەرچی بەبیری تەسك و نارۆشنی ئەوانا نەچوو ؛ بادەست بنێنە بینی‌و بیتاسێنن : بێ‌ئەوەی بیرێك لەوەبكەنەوە كە دارشتن و داتاشینی هەر زاراوەیەك پاش تۆژینەوەو هەڵسەنگاندنێكی زۆر كراوە ، لەهەموو بارێكی زانستی‌و رێزمانی‌یەوەو مەسەلەكە هەر قیروسیاو لەكوڵ خۆ كردنەوە نەبوو ، كەواتە پیاچوونەوەو بژاركردن و هەڵسەنگاندنی ئەو كتێبانە ئەبێ لەلایەن شارەزاو

پسپۆڕێکی کارامەوە بێ بە هاوکاری لیژنە وەرگێڕەکە ...!
نەك (زۆر بەداخەوە) وەك کتێبە داماوەکانی بەکوردی خوێندن کە (بەزۆری !) دەدرێتە بەر نەشتەری ناشیانەی کەسانێك کەفریان بەسەر ئەو کارەوە نییە بۆ نموونە : بژارکردنی کتێبەکانی فیزیاو کیمیاو زیندەوەرزانی و بیرکاری و کۆمەڵایەتی‌و ئەدەب و ڕێزمانی کوردی هەموویان درابوون بە تاقەکەسێك کە کەمێك دەستی نووسین یان وەك ئەڵێن هەڵس و کەوتێکی هەیە لەگەڵ ئەدەب و ڕۆشنبیریدا !
بۆیە زۆر بەداخەوە هەرکتێبێك دەگریت دواچاپە چەند جار بژارکراوەکەی لە یەکەم چاپی کتێبەکە زۆر ناقۆڵاو هەڵاوی‌و کەمووکووڕ ترە .
جا بۆئەوەی مامۆستایانی بەرێزو قوتابیانی خۆشەویست و خوێنەرگەلەیی لە ئێمە نەکەن و ڕوو زەردی بەکوردی خوێندن نەبین : بە پێویستمان زانی هەندێکی زۆر کەم لەو زاراوەو ڕستەو دەستەواژەو دەربڕینانەی سەرپەرشتیاری چاپ کردنی کتێبی ناوبراو دەستدرێژی کردوّتە سەریان و نەزانانە؛ بە ئارەزووی خۆی گۆڕیونی و ئەو کتێبەی بەو مەرەیە بردووە : بخەینە بەرچاو تەنها وەك (مشتێکی نموونەی خەرباریك ..!) و هیچی تر :
**١ـ سەرپەرشتیاری چاپ کردنی کتێبی ناوبراو ووشەی [گەل]ی خستوّتە پاڵ [ناو] بۆئەوەی بیکاتە [کۆ] : بۆ نموونە [رووەك : النبات] ؛ کردوێتی بە [رووەکگەل : النباتات] یان [پرۆتین : بروتین] ؛ کردوێتی بە [پرۆتینگەل : البروتینات] .**
کورد ووشەی [گەل]ی خستوّتە پاڵ هەندێك [ناو] بۆ کۆمەڵێکی تایبەتی بەکاری هێناوە .. وەکو [گاگەل] واتە کۆمەڵێك گاو مانگا : [کورگەل] واتە کۆمەڵێك کوری هەرزەکار : [کەرگەل] واتە کۆمەڵێك گوێ درێژ ... نەشی ووتوە [گورگ گەل] بۆ کۆمەڵێك گورگ . چونکە لەسەر زمان گران بووە : بۆیە پاش و پێش خراوەو کراوە بە [گەلە گورگ] بۆ ئاسان کردن و ڕەوانی لەسەر زمان . هەروەها کورد : بۆ کۆمەڵێك ئەسپ یان بەراز نەیووتوە [ئەسپ گەل یان بەرازگەل] ، بەڵکو ووتویەتی [رەوە ئەسپ یان رەوە بەراز] : بەم پێیە کورد بۆ کۆمەڵێك چۆلەکە یان ریشۆڵە نەی ووتوە [چۆلەکە گەل یان ریشۆڵە گەل]بەڵکو ووتویەتی [پۆلە چۆلەکە یان پۆلە ریشۆڵە] .
بەم شێوەیە [گەل] بۆ کۆی هەموو شتێك نەگونجاوەو هەرگیز بەکارنەهێنراوە تەنانەت بۆشتی تایبەتیش لەباری کۆمەڵێکدا .
کاکەی سەرپەرشتیاری کتێبی ناوبراو ؛ ئەو ووشەو زاراوانەی کە لە دەقە عەرەبییەکەدا بە [کۆ] دانراوە ، [گەل]ێکی خستوّتە پاڵ بۆ ئەوەی بیکاتە [کۆ] وەکو: [راستیگەل: الحقائق] ؛ [ئەنجامگەل : النتائج] ، [یەکەگەل : الوحدات] ، [پارچەگەل : الأجزاء] ، [ناوچەگەل : المناطق] ، [فرمان گەل : الوظائف] ، [گەمیتگەل : الكميتات] ، [پرۆتینگەل: البروتينات] ، [کرۆمۆسۆمگەل : الكروموسومات] ، [ئەلیلگەل : الاليلات] ، [رووەکگەل : النباتات] ، [وەچەگەل : الأبناء] ، [بازدگەل : الطفرات] ، [سیفەتگەل : الصفات] ، [بۆهێڵگەل : المورثات] .
براله هەندێ ووشەو ناو هەن لەگەڵ دارشتنی ڕستەدا ئاسایی کۆدەکرێنەوە : وەکو [الصفات : سیفەتەکان] ، [الكروموسومات : کرۆمۆسۆمەکان] ... هتد ئەمە جگە لەوەی کە هەندێ ووشەی [ناو] خۆیان مانای [کۆ] دەبەخشن و دەگونجی کۆنەکرەینەوە : وەکو مرۆڤ ، درەخت ، گیا گوڵ ... هتد .
**٢ـ زاراوەی [الطبقات الجرثومية]**
لیژنەی وەرگێڕان ئەم زاراوەیەی داناوە [پێکهێنە چینەکان] سەرپەرشتیاری چاپ کردوێتی بە [چینە میکرۆبییەکان] [الطبقات الجرثومية] لە ژیانزانیدا بەمانای [الطبقات المولدة] دێت .. واتە خانەکانی ئەم چینە توانای پێکهێنانی خانەی تریان هەیە کە بە گۆڕان تایبەتبوون و شێوەگری : ئەندامەکانی کۆرپەلە پێك دێت .
کاکە برا .. خانەکانی ئەم چینە میکرۆب [جرثومە جراثیم] نین وەکو تۆ تێ‌گەیشتووی بەڵکو ئەو چینە بنەچانە [نەژادانە]ن کە کۆرپەلەی گیانەوەریان لێوە دروست دەبێت .
هەروەها لە ڕووەکیشدا نموونەمان هەیە :
لە بۆرگی نێرەکی گوڵدا : چینێك خانە لە سەرەتادا پەیدا دەبێت ، بەو خانانە دەڵێن [الخلايا الجرثومية المولدة الحبوب

لقاح] .. بەواتەی تۆ دەبێ پێیان بڵێن [خانە میکرۆبییەکانی هەڵاڵە] ؛ بەڵام مانا زانستییەکەی [پێکهێنە خانەکانی هەڵاڵە]یە .

هەروەها خانەیەك لە خانەکانی گوێزەڵەی هێلکۆکەی مێیەکی (المدقة) گوڵیش ؛ گەورە دەبێت پێی دەڵێن [الخلية الجرثومية المولدة للكيس الجنيني] ؛ بەواتەی سەرپەرشتیار دەبێ بەمیش بوترێت [خانە میکرۆبییەکەی کۆرپەلە توورەکە]؛ بەڵام مانا زانستییەکەی [پێکهێنە خانەی کۆرپەلە توورەکەیەم ؛ واتە ئەم خانەیە بنچینەیە بۆ دروستکردنی کۆرپەلە توورەکە .

**٣- ووشەی [الفقس]**

لیژنەی وەرگێڕان ئەم زاراوانەی داناوە [ترووکان ، هەڵهاتن] سەرپەرشتیار کردویێتی بە [سەر لە هێلکە جووقان] ووشەی [ترووکان] بۆ هەڵهاتنی گەرای مێروو ماسیو هێلکەی بۆق و خشۆك بەکارهێنراوە ؛ ووشەی [هەڵهاتن]یش بۆ باڵندە بەکارهێنراوە ... هەرچی [سەر لەهێلکە جووقان]یشە بۆ بارێکی تایبەتی وەکو پەندێك بەکارهێنراوە ، وەکو بڵێین [فلان هێشتا سەری لە هێلکە نەجووقاوە ئەمە کرداریێتی] واتە [هێشتا منالە] .. بەویێیە هەر لەم جۆرە بارانەدا بەکارهێنراوە ؛ کەچی کاکی سەرپەرشتیار ئەو ووشە جوانە پراوپڕانەی لە کار خستووەو شتێکی تری هێناوەتە کایەوە کە بەهیچ جۆرێك گونجاونیە .. بگرە هەڵەیە .

**٤- زاراوەی [التشكل Morphogenesis ]**

لیژنەی وەرگێڕان ئەم زاراوەیەی داناوە [شێوەگری] سەرپەرشتیار کردوێتی بە [هەڵپێکان]

لەوانەیە ووشەی [هەڵپێکان] لەناوچەی گەرمیاندا بۆ هەڵپێچانی بەری رووەك واتە [عقد الثمار] بەکاربهێنرێت .. بەڵام پراوپڕ ؛ مانای زانستی [التشكل] ناگرێتەوە کە بریتییە لەو گۆڕانانەی بەسەر هێلکەی پیتراودا دێت چ رووەك بێت یان گیانەوەر هەتا ئەندامەکانی کۆرپەلە شێوەی خۆیان وەردەگرن...

جا لەبەر ئەوە زاراوەی [شێوەگری] راستەوخۆ ئەم چەمکە زانستییە دەخاتە بەرچاو [هەلپێکان]یش ؛ دوورە لەم چەمکە زانستییەوە .

**٥- زاراوەی [علم الأجنه التجريبي]**

لیژنەی وەرگێران وای داناوە [تاقییە کۆرپەلە زانی] یان کۆرپەلە زانی تاقیگەری سەرپەرشتیار کردویێتی بە [زانستی تاقیکراوەی کۆرپەلە] لەوەوپێش [کۆرپەلەزانی] بۆ [علم الأجنة] دانراوەو چەسپاوە ؛ ووشەی [التجريبي]شی خراوەتە پاڵ بووە بەو زاراوە راست و رەوانە [تاقییە کۆرپەلە زانی] کە پراوپڕی چەمکە زانستییەکەیەتی .

خۆ ئەگەرهاتو زاراوەکەی سەرپەرشتیارمان کردەوە بە عەرەبی دەبێ بڵێین [العلم المجرب للجنين] ؛ ئەمەش بەهیچ جۆرێك چەمکی زانستی [علم الأجنة التجريبي] ناگرێتەوە .

**٦- عبارة [ثم غلف أزهار كل منها باعتناء تحاشياً لتلقيحها بحبوب لقاح غريبة]**

لیژنەی وەرگێران ووتویەتی [ئینجا گوڵەکانی بە ئەسپایی داپۆشی تاوەکو بە دەنکە هەڵاڵەی گوڵیتر نەپەرن]

سەرپەرشتیار کردویێتی بە [ئینجا گوڵەکانی بە ئەسپایی داپۆشی تاوەکو بە دەنکە هەڵاڵەی بێگانە ئاووس نەبن]

١- ووشەی [ئاووس] هەر بۆ گیانەوەرە شیردەرەکان و بە دەگمەنیش بۆ مرۆڤ بەکارهێنراوە .. هەرگیز بۆ رووەك بەکارنەهێنراوەو ناهێنرێت .

٢- دوایی ؛ چەمکە زانستییەکەی [التلقيح Pollination ] ، هەرگیز ئاووس بوون ناگرێتەوە... زاراوەی [پەڕین] چەسپاوەو بۆ مرۆڤ و گیانەوەرو رووەکیش بەکارهێنراوە و بەکاردەهێنرێت .

٣- [ئاووس بوون] ئەو بارەیە کە دوای [پەڕین] و [پیتێن] بە دروست بوونی کۆرپەلە ؛ لە مرۆڤ و گیانەوەرە شیردەرەکاندا دەردەکەوێت .

**٧- عبارة [تم تلقيح حنطة شبەقزمية يابانيه باخرى مكسيكية]**

لیژنەی وەرگێران ووتویەتی [گەنمی نیمچە کورتی (گرگنەی) ژاپۆنی لە گەنمی مەکسیکی پەڕێنرا] سەرپەرشتیار کردویێتی بە [گەنمی نیمچە کورتی ژاپۆنی بە گەنمی مەکسیکی چاك کرا] ووشەی [چاك کردن] لە راستیدا بە مانای [التحسين] دێت .

هەندێك جاریش لە لادێ بەمانای [پەڕین] دێت تەنها بۆ ماین و گوێ درێژو ئاژەڵ و مەڕومالاّت : بە مەبەستی چاك كردنیان [التحسـین] بە جۆری رەسەن . بەلاّم هەرگیز ووشەی [چاك كردن] بە مانای [پەڕین] واتە [التلقیح] بۆ رووەك نەشیاوەو بەكارنەهاتوە ؛ بەڵێ ووشەی [چاك كردن] بە مانای [التحسین] بۆ رووەكیش بەكارهاتوەو بەكاردێت .

**٨ـ عبارة [افترضت وجود وحدات وراثیة اطلق علیها إسم العوامل Factors**

تنتقل بواسطة الخلایا التناسلیه وتسبب ظهور الصفات الوراثیة لدی الفرد]

لیژنەی وەرگێڕان ووتویەتی [وەهای دانابو كە یەكەی بۆماوەیی هەن ناوی هۆكـارەكـانـی Factors لێنـابـو كە لەرێگـەی توخمـە خانـەكـانـەوە دەگوێزرێتەوەو دەبنە هۆی دەركەوتنی بۆماوە سیفەتەكانی تاك]

سەرپـەرشتیـار كردوێتی بە [وەهـای دانابو كە یەكەگەلی بۆ ماوەیی هەن ناوی هۆكـارەكانی Factors لێنابوو كە لەرێگەی خانە دەست تێكەڵیەكانەوە دەگوازنەوە .

دەبنە هۆی دەركەوتنی سیفەتە بۆ ماوەیییەكان لەتاكی زیندەوەردا]

كاكی سەرپـەرشتیـار ..! [یەكەگەل]ی بۆ [الوحدات] دانـاوە ؛ هەروەكو لەپێشەوە بەدرێژی باسمان كردو روونمان كردەوە ..[گەل] بۆ [كۆی] هیچ ووشەیەك دانەنراوە چ ئەدەبی یان زانستی ؛ تەنیا بۆ هەندێك ووشە (ناو) نەبێت كە نیشانەبێت بۆ كۆمەڵێك وەكو [كورگەل] ، [گاگەل] .

بابێینەوە سەرەوكاری [خانەدەست تێكەڵیەكان] : كە ئەمـەیـان زۆر سەرسـوورهێنـە .. بەپێی دەقە عەرەبییەكە [الخلایا التناسلیة]ت كردووە بە [خانە دەست تێكەڵ]ی یەكان .

كاكە برا [دەست تێكەڵی] یان [دەست تێكەڵ كردن] ئەو مانـایە دەبەخشێت كە ئافرەتێكی داوێن پیس دەست لەگەڵ پیـاوێكـدا تێكـەڵ دەكات بە مەبـەستی توخمكاریجا لەبەرئەوە؛ ئەوزاراوە مەبەست جوانەی تۆ ؛ فری بەسەر زاراوەی [توخمە خانەكان]ە وە نیە .

**٩ـ عبارة :**

**[یمكن أن یحدث فیه تلقیح ذاتی لأن أزهاره خنثیة]**

لیـژنـەی وەرگـێڕان ووتـویەتی [لەبەر ئەوەی گوڵەكانی نێرەمـووكن لەوانـەیـە پەڕینیان خۆیی بێت سەرپـەرشتیار كردوێتی بە [لەبـەر ئەوەی گوڵەكـانی نێرەمـووكن لەوانـەیـە خۆبـەخۆ كەڵ بدرێت [كەڵ] بەمانای [الفحل] دێت ... واتە [كەڵەگا]ش بە مانای [الثور الفحل] چەسپاوە [مانگا بەكەڵ] ئەو مانگایەیە كە لە كاتی خۆیدا بۆ جووت بوون ئارەزومەندی [كەڵەگا]یە ئەوەش ئاشكرایە كە [كەڵدان] هەر بۆ جووتكردن یان پەڕینی ئاژەڵ هاتووە، نەش ووتراوە [ماین]ە كە كەڵدراوە : بەڵكـو ووتـراوە [ئـەسپ] لە [ماین] پەڕێنراو ئەوەتا ووشـەی [كەڵدان] بۆ هەندێك گیانەوەر بەكاردێت و بۆ هیتر نەشیاوە : هەرگیـز بۆ رووەكیش بەكـارنـەهـاتووەو بەكارنایەت .. بەڵكو [پـەڕین] بەگشتی بۆ گیـانـەوەرو رووەكیش بەكـارهـاتووەو چەسپاوە .

كاكە برا ... ئەم زاراوانە لە دێر زەمانەوە چەسپاون و لە شوێنی خۆیاندا بەكاردەهێنرێن نەك هەروا بە هەردەمەكی :

پەڕین : التلقیح ، خۆپەركێ : التلقیح الذاتي

پیتێن : الاخصاب ، لێكدان : التضریب ،

جووت بوون جووت گرتن : التزاوج

دوو رەنگین دوورەگكاری : التهجین

**١٠ـ ووشەی [البروزات processes ]**

لیژنەی وەرگێران ئەم زاراوەیەی داناوە [لق و پۆپەكان]

سەرپەرشتیار كردوێتی بە [دڕی یەكان]

ووشەی [دڕ] لەعەرەبیدا بە مانای [شرس] دێت یان بەمانای [دڕكـاوی] ؛ واتـە [ذو أشـواك] . راستییە زانستییەكەشی ئەوەیـە كە لەشی دەمـارەخـانـە لقی زۆری لێدەبێتـەوە كە شێوەیەكی وەكو درەخت وەردەگرن ، بۆیە ئەم لقانە بەكۆمەڵ پێیان دەوترێت [التشجرات dendrites ] واتە لق و پۆپەكان ئەم لق و [دڕ] نین دەست بریندار ناكەن .. بەڵكو شێوەی لق و پۆپی

درمختیان هەیە ؛ بۆیە بەعەرەبی ناوبراوە بە [التشجرات].
خۆ ئەگەر سەرپەرشتیار بیکردایە بە [دەرپەریوەکان] کەمێك لە چەمکە زانستییەکەی نزیکی ئەخستەوە .

### ١١-زاراوەی [الغشاء الخلوي]

لیژنەی وەرگێران وای داناوە [خانە پەردە]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [پەردەی خانەیین]
زاراوەی سەرپەرشتیار ئەوە دەگەیێنێت کە پەردەکە لەخانە پێکهاتوە یان خانە خانەیە .. بێگومان چەمك و مانا زانستییەکەی ئەوەیە کە ئەم پەردەیە بەشێکە لەبەشەکانی خانەو دەوری ناوەرۆکەی داوە ؛ واتە [خانە پەردە] . خۆئەگەر سەرپەرشتیار بیکردایە بە [پەردەی خانە] راست و دروست مانای خۆی وەردەگرت .. بەڵام ئەو نووسراوە بە دەقە عەرەبییەکەیەوە ، واتە [خلوي] .. بۆیە کردویتی بە [خانەیین]و ماناکەی لەگرێژنە بردوە .

### ١٢-زاراوەی [الغشاء العضلي]

لیژنەی وەرگێران وای داناوە [ماسولکە پەردە]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [پەردەی ماسولکەیی]
زاراوەی سەرپەرشتیار ئەوە دەگەیێنێت کە ئەم پەردەیە لە ماسولکە پێکهاتوە یان لەشێوەی ماسولکە دایە .. بەڵام راستییەکەی لەزاراوەی لیژنەی وەرگێراندا هاتوە .. [ماسولکە پەردە] ؛ ئەو پەردە تایبەتییەیە کە ماسولکەی داپۆشیوە ، باهیچ نەبێ پەردەی ماسولکە بوایە .

### ١٣-زاراوەی [السمحاق الغضروفي]

لیژنەی وەرگێران وای داناوە [کرکراگە پەردە]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [پەردەی کرکراگەیی]
زاراوەی سەرپەرشتیار بەتەواوی نابەجێیە .. هەر بەجارێ مانا زانستییەکەی شێواندوەو ئەوە دەگەیێنێت کە ئەم پەردەیە لە کرکراگە پێکهاتوە یان لەشێوەی کرکراگەدایە ـ هەروەکو ئەوانەی پێشوو ـ زاراوەی لیژنەی وەرگێرانیش روون و ئاشکرایە .. [کرکراگە پەردە] ئەوە دەگەیێنێت کە رووی کرکراگە بە بەرگێك داپۆشرا کەلە جۆرە شانەیەکی تر پێکهاتوە . خۆ ئەگەر سەرپەرشتیار بیکردایە بە [پەردەی کرکراگە] ماناکەی نەدەشێوا .

### ١٤-زاراوەی [العضيات الخلوية]

لیژنەی وەرگێران وای داناوە [خانە ئەندامۆکە]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [ئەندامۆکەی خانەیی]
زاراوەی سەرپەرشتیار ئەو دەگریتەوە کە ئەندامۆکەکان لەخانە پێکهاتوون یان لە شێوەی خانەدان .. ئەمەش ؛ بە ئاسانی قوتابی بە هەڵەدا دەبات ، چونکە ئەندامۆکە ؛ خانەیی نابێت بەڵکو لە ناو خانەدا دەبێت .. بۆیە یەکسەر لە زاراوەی لیژنەی وەرگێران دەگات و دەزانێت کە ئەندامۆکە جۆرێکە لە زیندە ناوەرۆکەکانی خانە .. ئیتر بۆچی سەر لە خۆمان و قوتابیش بشێوێنین ؟!

### ١٥-زاراوەی [لييفات عضلية]

لیژنەی وەرگێران وای داناوە [ماسولکە ریشاڵۆکەکان]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [ریشاڵکە ماسولکەییەکان]
زاراوەی سەرپەرشتیار ئەوە دەگەیێنێت کە ریشاڵۆك لە ماسولکە پێکهاتووە یان لەشێوەی ماسولکە دایە .. واتە ئەوە ناگەیێنێت کە ماسولکە ریشاڵۆکی هەیەو لەوان پێکهاتووە ؛ وەکو لە زاراوەی لیژنەی وەرگێراندا [ماسولکە ریشاڵۆکەکان] ؛ ئاشکرایە

### ١٦-زاراوەی [الالياف العضلية]

لیژنەی وەرگێران وای داناوە [ماسولکە ریشاڵەکان]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [ریشاڵە ماسولکەییەکان]
ئەمیش هەروەکو [اللييفات العضلية] وایە ؛ لەپێشەوە شیکراوەتەوە .

### ١٧-زاراوەی [اللييفات العصبية]

لیژنەی وەرگێران وای داناوە [دەمارە ریشاڵۆکەکان]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [ریشاڵە دەمارییەکان]
ئەمیش هەروەکو زاراوەی [اللييفات العضلية] وایە ؛ ئەوە دەگەیێنێت کە ریشاڵۆکەکان لە دەمار پێکهاتوون یان لە شێوەی دەماردان .. واتە ئەوە ناگەیێنێت کە دەمار ؛ ریشاڵۆکی هەیەو لەوان پێکهاتووە وەکو لەزاراوەی لیژنەی وەرگێراندا [دەمارە ریشاڵۆکەکان] ئاشکرایە .

### ١٨-زاراوەی [الألياف العصبية النخاعينية]

[ Meylinated nerve fibers ]

لیژنەی وەرگێرا وای داناوە [مۆخینە دەمارە ریشاڵەکان]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [ریشاڵە دەماری‌یەکانی مۆخین]
بە پێی زاراوەی سەرپەرشتیار دەبێ ریشاڵەکان لە شێوەی دەمارداین و هی مۆخین بن ؛ ئەمەش ماناکەی ئاڵۆزو شێواوەو بە هیچ جۆرێك چەمکە زانستی‌یەکەی ناگرێتەوە ... بەلام کە دەڵێن [مۆخینە دەمارە ریشاڵەکان] ؛ یەکسەر دێتە بەرچاومان کە ئەو ریشالانەی دەماریان لێ‌پێکهاتووە لە جۆری مۆخینن .

۱۹- زاراوەی [الألیاف العصبیة اللانخاعینیة Unmeyli-nated nerve fibers]

لیژنەی وەرگێران وای داناوە [بێ مۆخە دەمارە ریشاڵەکان]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [ریشاڵە دەماری‌یەکانی بێ مۆخین]
لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەمیش ؛ وەکو ئەوەی پێشووی وایە .

۲۰- عبارة [تحتوي الخلیة العضلیة القلبیة علی لییفات مخططة عرضیاً]

لیـژنـەی وەرگێران ووتویەتی [ریشاڵۆکەکان ماسولکەخانەی دڵ؛ بە پانی میلدران]
سەرپـەرشتیـار کردویتی بە [خانەی‌ماسولکەی دڵ ریشاڵۆکە پانە میلدارەکانی تێدایە]

لیژنەی وەرگێران ؛ ئەو دەستەواژەیەی بەو شێوەیە دارشتوە کە پراوپری چەمکە زانستی‌یەکەیەتی لە دەقە عەرەبی‌یەکەیدا .. کەچی سەرپـەرشتیار بەو شێوەیە گۆریویتی کە ماناو چمکە زانستی‌یەکەی ناگرێتەوە .. ئەوە دەگەیێنێت کە ریشاڵۆکەکان پان و میلدارن ؛ ئەوە ناگرێتەوە کە بە پانی میلدارن .
خۆ ئەگەر هاتو دەستەواژەکەی سەرپەرشتیارمان کردەوە بە عەرەبی ، دەبێ بڵێین : [تحتوی الخلیة العضلیة القلبیە علی لییفات عریضـە مخـططة] ؛ ئەمـەش دوورە لەماناو چەمکە زانستی‌یەکەوە .

۲۱-زاراوەی [الأوعیة الشعریة الدمویة]

لیژنەی وەرگێران وای داناوە [خوێنە موولوولەکان]
سەرپەرشتیار گۆریتی بە [لولەی خوێنی وەك مووباریك]
بێ گومان گۆرینی سەرپەرشتیار : نابەجێ‌یە .. چونکە لە زاراوە دەرچووە و شێوەی لێکدانەوەی وەرگرتوە .

۲۲-زاراوەی [الأوعیة الشعریة اللمفیة]

لیژنەی وەرگێران وای داناوە [لیمفە موولوولەکان]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [لوولە لیمفە وەك مووباریکەکان]
ئەم زاراوەیەش ؛ دووچاری هەمان گۆرینی وەکو زاراوەی پێشو بووە .

۲۳-زاراوەی [الأعضاء اللمفیة]

لیژنەی وەرگێران [لیمفە ئەندامەکان]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [ئەندامی لیمفینەکان]
هەمان هەڵەی پاش و پێش خستنی بەسەردا سەپێنراوە ..!

۲٤- زاراوەی [الحـامض النـووي الرایـبـي منـقـوص الأوکسجین] deoxyribonucleic acid

لیژنەی وەرگێران وای داناوە [رایبە ناوکە ترشی ئۆکسجین کەمکراوە]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [ترشە ناوکینی رایبی ئۆکسجین ناتەواو]
هەمان هەڵەی پاش و پێش خستنی بە سەردا سەپێنراوە .

۲٥-ووشەی [الحقول]

لیژنەی وەرگێران [کێڵگە]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [گەورگەل]
یەکەم [گەور] ، [حقل] نیە ، بەڵکو ئەو ژوورەیە کە بە زستان ئاژەڵ و مەرو مالاتـی تێـدا دەحـەوێتـەوە .. ئینجـا کۆش کراوەوەتەوەو بوە بە [گەورگەل] بە مانای [الحقول] هەر وەکو لەپێشەوە باسمان کرد .

۲٦-ووشەی [تقدیر ؛ تخمین]

لیژنەی وەرگێران [قەبلاندن]
سەرپەرشتیار کردویتی بە [خەملاندن]

قەبلاندن] ؛ بۆ ئەندازە دانانی شتێك لە بابەت نرخی‌یەوە یا چەندێتی‌یەوە بەكاردەهێنرێت ، بروانە ل ٤٤ بەرگی سێیەمی فەرهەنگی خاڵ ـ واتە بە مانای [تقدير ، تثمين ، تخمين] دێت .
خەملاندن] ؛ بەمانای (خەملین)و خۆرازاندوە (بە تایبەتی بۆ ئافرەت)و رازاندنەوە بەكاردەهێنرێ نەك بۆ قەبلاندن ؛ واتە تقدير ؛ تخمين] ـ فەرهەنگی ماموستایان توفیق وەهبی‌و ئەدمۆنس ل /١٥٧ ؛ دەڵێت : [خەملین] یا [خەملاندن] بە مانای رازاندنەوە be decorated بەكاردەهێنرێ ، خۆخەملاندن]یش مانای خۆرازاندنەوەی ئافرەتە بە زێروزیوو متوموورو(Put on Finery (exp . women .

بەداخەوە كاكی سەرپەرشتیارو زۆر كەسی تریش ؛ خەملاندن] بە [تقدير ؛ تخمين] تێگەیبون و لە شوێنی یەكتر بەكاری دەهێنن ، لە كاتێكدا جیاوازی زۆرە لە نێوانیاندا ، هەروەكو لە سەرەوە روونمان كردەوە .

بەم پێیە سەرپەرشتیاری چاپ كردن دەستكاری یەكی ...ی كتێبی زیندەوەرزانی پۆلی شەشەمی زانستی كردوە ئیتر ...ن بە هەڵە گۆریویێتی یان خستویەتە بارێكی ناگونجاوەوە كە ...ری بەسەر چەمكە زانستی‌یەكەوە نیە . ئەم زاراوانەو زۆری تریش لە دەستكاری كردنی سەرپەرشتیار رزگاریان نەبوە :

| زاراوەی عەرەبی | زاراوەی لیژنەی وەرگێران | زاراوەی سەرپەرشتیار (پاش گۆرینی) |
|---|---|---|
| ـنسبة القدم | سەرەپێ‌یەكان | پێ‌لەكەڵە رواوەكان |
| ـقرص | برانەوە | كوێربوونەوە |
| ـصخور البركانية | ئاگرە بەردەكان | بەردەئاگرینەكان |
| ـشقوق الخيشومية | ریشوودارە تڵیشەكان | تڵیشە ریشودارەكان |
| ـقواس الأبهرية | شاخوێنبەرە كەوانەكان | كەوانەشاخوێنبەرەكان |
| ـصمر | دەمپوكێتەوە | دەمدا لە كەمی |
| ـصيفية | پۆلینراو | پۆلینكراو |
| ـسيج عصبي ظهري | پشتە دەمارە بۆری | لوولە دەماری پشت |
| ـمت ضموراً | پووكاوەتەوە | داوێتی لە لاوازی |
| ـسام مضادة | دژە تەنەكان | تەنگەلی دوژمن |
| ـشجرة التعنيفية | پۆلێنە درەختی بنەماڵە | داری بنەماڵەی پۆلینكاری |
| ـحبة العصبية | دەمارە خانە | تاڵەدەمار |
| ـوراق الكأسية | كاسە پەرەكان | سیپاڵی‌گوڵ ؛ پەلكەسیپاڵ |
| ـسيلات العصبية | دەمارە لێشاوەكان | لێشاوەكانی دەمار |
| الحبل العصبي | ناوكە پەتك | پەتی ناووك |
| الحبل الظهري | پشتە پەتك | پەتەكەی پشت |
| الأبناء | وەچە | بەچكە ؛ رۆڵە |
| النسيج الدهني | چەوریيە شانە | شانەی بەز |
| الطرز المظهري (PhynoType) | روخسارەچەشن | رووكار بابەت |
| الطرز الوراثي (GenoType) | بۆماوە چەشن | بۆماوە بابەت |
| سباق | پێش بركێ | نەبەرد |
| البيئة | دەروبەر | بيئە |

جا وەكو ووتمان ؛ ئەم كتێبە داماوە زۆر نارەوایانە دەستكاری كراوەو زۆربەی زاراوەكانی بە گۆرینی ناشیانە تاسێنراوە .. بەخەربار هەڵەی زانستی‌و رێزمان دووچاركراوە كە ئێمە ؛ دوای چاپ كردن و پیاچوونەوەی ـ مشتێكمان لێوەرگرتوە بۆ ئەوەی بتوانین لە چەند لاپەرەیەكی گۆڤارێكدا بلاوی بكەینەوەو ئێوەی خوێنەرانی بە رێزیش لە رەفتاری نابەجێی ئەو كەسانە ئاگادار بكەین كە (بەداخەوە.!)كوێرانە دەست دەخەنە كارێكەوە ؛ ئیشی ئەوان نیە .. هەرچی هەیە ناشی‌یانە دەیشێوێنن .. بۆیە پێشینان بە خۆرایی نەیان ووتوە «نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب» .

لیژنەی وەرگێران

فؤاد عزت مصطفى

عبدالله ابراهيم السراج

جمال عبدول محمد

فريدون محمد فرج



...ستی پەنجەو لە ژمارە (٩٠٥)ی رۆژنامەی هاوکاریی خوشەویستدا ...ەە کردەوە کە ئەو هەڵبەستەی کوردی لەسەر کێشی عەرووز بوو. ...سەرێکی بەڕێز بە ناوی کاوە فیداوە لە ژمارە (٩٢٩)ی هەمان رۆژنامەدا ...ری (پێنج خشتەکیەکەی ژێر لە تەرازووی عەرووزدا) وای بۆ چوو بوو ...ە رووی کەمتوانایی و نەشارەزاییمەوە لە کێشەکانی عەروزدا پەنام بۆ ...ی پەنجەبردوە. یان وەك من پەیم بەوە نەبرد بێ کە ئەو عەروزەو ئەم ... بە بەڵگەی ئەوەی زۆر خۆی ماندوو کردوە بە کێشانەی هەنگاو ...عیە)ە کانەوە.

هە‌ر چۆنێك بێت کارەکەی ئەو نووسەرە بەڕێزە شایانی سوپاسە. ...کە ئەو وای زانیوە بۆیە وای نووسیوە. ئەم کارەی ئەویش لە کاری ...) ئەچێت، ئەگەر پێکای ئەوا دوو پاداشتی ئەبێت. پاداشتی ...د)ەکەی و پاداشتی پێکانەکەشی. ئەگەر نەشی پێکا ئەوا پاداشتی ...دەکەی هەر ئەبێت.

...یش لای خۆمەوە بە پێویستی ئەزانم روونی بکەمەوە کە ئەو برادەرە ... هەنەکارەکەی من گەیشتوە. دیارە کە کێشەش پەیدابوو. پێویستە ...گە ...وەرهێنەرو وەك ئەڵێن (مەلموس)بێت. ئەگینا قسەی رووت ناچێتە ...گیرنەوە. روونکردنەوەکەشم لەم دوو خاڵەدا ئەبێت:

- من زانیومە هەڵبەستەکەی کوردی لەسەر کێشی عەروزەو ئەوەکەی ...ش نەسەرکێشی پەنجەیە، بە بەڵگەی ئەوەی هەر دوو رۆژ دوای ...وکردنەوەی پینجخشتەکیەکە، مامۆستا دڵشاد مەریوانی ویستی لەو ...یەوە پرسیارێکم لێبکات. منیش نەم هێشت پرسیارەکەی تەواو ...کات. پێم وت من بە کێشی پەنجە عەروزەکەی کوردیم کردوە بە پێنج ...حشتەکی وەك تاقیکردنەوەیەك ئەم راستیەم بۆ مامۆستا عەبدوڵا ئاگرینیش هە‌ر بەو جۆرە درکان.

...لێرەدا هەندێك لەو بارەیەوە بدوێین و بزانین ئەو کارەی من گونجاوو ...روست بووە یان نا؟.

من دوای سەرنج دان و لێکوڵینەوە، گەیشتوومەتە ئەو ئەنجامەی کە هەموو هەڵبەستێکی عەروزی عەرەبی بە ترازووی پەنجەی کوردیش ...کێشرێت و ئەشگونجێت کێشی عەروزو کێشی پەنجەی کوردی لە ھەڵبەستێکی کوردیدا تێکەڵاو کرێت بێ ئەوەی موسیقای هەڵبەستەکە ...تێك بچێت، بەڵام پیچەوانەی ئەم بۆ چوونە راست دەر ناچێت، واتا هەموو هەڵبەستێکی پەنجەی کوردی بەترازووی عەروزی عەرەبی ناپەتە کێش.

بۆ زیاتر روونکردنەوە. دوو نموونە لە هەڵبەستی مامۆستا گوران[٤] ئەهێنینەوەو لەسەری ئەدوێین:

**نموونەی یەکەم:**

**ئەوا دیسان لەگۆشەی نادیاری**
**دڵم هەستا زرەی زەنگی فگاری**

**نموونەی دووەم:**

**ئەڕۆیشتم بە ئەسپایی کش و مات**
**لاشە سست و دڵ کەیلی تاسەو ئاوات**

**ئنجا سەرنجی ئەم خاڵانە ئەدەین:**

**ا - نموونەی یەکەم بە ترازووی عەروز ئەکێشین. ئەبینین بریتیە لە کێشی هەزەجی شەش برگەیی مەحزوف:**

**مفاعیلن مفاعیلن فعولن**
**ب--- ب--- ب--**
**مفاعیلن مفاعیلن فعولن**
**ب--- ب--- ب--**

**بە ترازووی پەنجەش بریتییە لە کێشی یازدە برگەیی.**

**ب - نموونەی دووەم بە ترازووی پەنجە ئەکێشین. ئەبینین ئەمیش هەر بریتییە لە کێشی یازدە برگە. بەڵام ئەگەر بە ترازووی عەروز بیکێشین ئەبینین بریتی نیە لەکێشی هەزەجی شەش هەنگاویی مەحزوف، واتا بریتی نیە لە:**

**مفاعیلن مفاعیلن فعولن**

**بەڵکو بریتییە لە:**

**مفاعیلن مفاعیلن فعلن**
**ب--- ب--- ب ب-**
**فاعلاتو مستفعلن مفعولن**
**-ب-ب --ب-ب- ---**

کە ئەمە هیچ کێشێکی عەروزی بەسەردا ناسەپێت.

ئیتر بەو جۆرە ئەبینین هەر هەڵبەستێکی عەروزی، ئەگەر بریتی بوو لە هەشت برگە، ئەوە بەکێشی پەنجەش ئەبێتە هەشت برگەیی، یا ئەگەر بریتی بوو لە دە برگە، ئەوا ئەبێتە دە برگەیی و شانزە بە شانزەیی و... هتد. بەڵام هەڵبەستە پەنجەییەکانی کوردی نابن بەو دەریایانەی هەڵبەستە

عەروزییەکان دروستیان ئەکەن ئەگەرچی ژمارەی برگە کانیشیان ئەوەندەی یەك بن ، وەك لە نموونە هەڵبەستی دووەمی سەرەوەدا پیشانمان دا .

تا ئێرە کارەکەمان ئاساییەو رەنگە ئەمە لەلای زۆر کەس ئاشکرا بێت . ئیستا دینە سەر ئاوازو سازی هەڵبەستو کێشیان کە ئەمەیان گرنگەو بزانین بە تێکەڵاو کردنی عەروز لەگەڵ پەنجەدا موسیقای هەڵبەستی تێك ئەچێت یان نا ، وە بۆچی ؟ باسەرنجێکی ئەم خالأنەش بدەین :

أ – نموونەی یەکەمی ئەو هەڵبەستەی سەرەوە کە لەسەر کێشی عەروزە ، پیشانی ئەدات کە بە جۆرێکی گشتی ئەبێ لە ژێر هەنگاوی مفاعیلن‌دا هەر مفاعیلن بێتو لەژێر فعولن‌دا هەر فعولن بێت . جگە لە هەندێك ئاڵوگۆڕی وەك زەحافو عِلە . کە ئەوانیش لە دەربڕینی دەنگ‌دا هەر ئەچنەوە سەر ئەو هەنگاوانە . ئەمە هەموو سەرجەمی هەڵبەستەکە پێویستە وابێ.
ب – نموونەی دووەمی ئەو هەڵبەستەی سەرەوە کە لەسەر کێشی پەنجەیە . پیشانی ئەدات کە مەرج نیە لەژێر هەنگاوی مفاعیلن‌دا هەر مفاعیلن بێت . یان لەژێر هەنگاوی فعولن‌دا

**هەر فعولن بێت . بەڵکو ئەشێ جارێك لەژێر مفاعیلن دا فاعلاتو بێت ،جارێکیش مستفعلن بێت ، وەك لەو نموونەیەدا هاتووەیان هەرهەنگاوێکی توی چواربرگەیی بێت . هەر وەها لەژێر فعلن دا مفعولن یان هەر هەنگاوێکی تری سێ برگەیی . ئیتر بەو جۆرە، تێکەڵ کردنیجۆرەکانی هەنگاو ، دروستە ، بە مەرجێك ژمارەی برگەکانیان ئەوەندەی یەك بن . ئەی کەواتە بۆچی بەپێی کێشی عەروز تێکەڵ کردنی هەنگاوەکان ئەبێنە هۆی لەنگیو ناسازی ، کەچی بەپێی کێشی پەنجە وا نیە ؟ .**

**هۆی ئەوە ، ئەوەیە کە کێشی عەروز لە نەژادا لەسەر هەڵبەستی عەرەبی دانراوەو سروشتی ئەو زمانەش وای پێویست کردوە . بەڵام کێشی پەنجە لەسەر هەڵبەستی کوردی دانراوە ، یان بڵێین هەڵبەستی کوردی لەسەر کێشی پەنجە وتراوە ، چونکە سروشتی زمانی کوردی پێویستە بەو بنەما عەروزییانە نەکردوە ، بەڵکر تەنیا ژمارەی برگە لە هەنگاوەکاندا بەس بووە بۆ رەوانیی هەڵبەست . چونکە لەراستیدا هەر زمانێك سروشتێك و تایبەتمەندێتییەکی خۆی هەیە کە ئەبێتە هۆی جیاوازیی سازو ئاوازی نێوان نەتەوە زمان جیاوازەکان .**

**هەر لەبەر ئەم هۆیەش ئەبینین موسیقای تورکی لەفارسی جیاوازە، ئینگلیزی لە ئەڵمانیو ئیسپانی لە فەرەنسیو عەرەبی لەکوردیو روسی لەچینی و . . . هتد جیاوازن .**

**کەواتە لە هەڵبەستی کوردیدا کێش و هەواو سازو ئاواز لەناو برگە درێژو برگە کورتەکان دا نیە کە هەنگاوەکان پێك دەهێنن ، بەڵکو لەناو سەرجەمی هەنگاوەکان خۆیاندا واتا ترپە (ایقاع) دەور ئەبینێ رەچاو نەکردنی ژمارەی برگەی درێژو ژمارەی برگەی کورت نابێتە هۆی شێواندنی کێش لە هەڵبەستی کوردیدا .**

**بۆیە ئەبینین لە هەنگاوێکی چواربرگەییدا ، بۆ نموونە ، سێ برگەی درێژ هەیە کە چی لە هەنگاوەکەی ژێریدا هەر چوار برگەکە درێژن . وەك ئەم هەڵبەستەی گۆران :**

**بە فرمێسکی پەشیمانی**
ب ــــ ب ـــــ
**ئەی زوهرەی ناز زوهرەی جوانی**
ـــ ـــ ـــ ـــ ـــ ـــ ـــ

**ئیتر بەو جۆرە برگەکانی هەڵبەست کێشی پەنجە هەر یەك لە ئاشێك ئەکەن ، کەچی هەڵبەستەکانیش لەنگ نین .**
**چونکە زمانە کوردییەکە ، زۆر بە پێزە لە رووی موسیقاوە .**

یان بە دەربڕینێکیتر : کێشی برگەکان ئەوەندە بەپێز (مرن)ن کە بە ئاسانی درێژو کورت ئەکرێنەوە لەکاتی دەربڕینی دەنگ‌دا کە لە ئەنجامدا برگەی کورتو برگەی درێژ هاوشان ئەوەستنەوە لەتێکرای ماوەی دەربڕینی هەنگاو (تفعیلەکە)دا . بۆ زیاتر رۆشن کردنەوەی ئەم راستیە : هەنگاوی (ئەی زوهرەی ناز) بە رواڵەت لەهەنگاوی (بەفرمێسکی) درێژترە . بەلاّم لەخویندنەوەدا . یان لەوتنی ئەو دوو هەنگاوەدا . بەبێ ئەوەی بە خۆمان بزانین . هەست ئەکرێت کە ئەوەندەی یەك (کاتیان ئەوێت) .

ئنجا ئیتر یان (ئەی زوهرەی ناز)ەکە کورت ئەکرێتەوە یان (بە فرمێسکی)یەکە درێژ ئەکرێتەوە بە پیی پێویستی فۆنەتیك . وەك وتمان ئەم کورت کردنەوەو درێژکردنەوەیە لەتێکرای هەنگاوەکەدا ئەبێت . نەك لە

گەکەندا بەتەنیا ، چونکە بە تەنیا هەمیشە بڕگەی (ئەی) لە بڕگەی (بە)
...ێتەوە .
...ە ئەوی ڕاستی بێ ئەم دیاردەیە پیویستی بە زیاتر لەسەر ڕۆیشتن‌و
...کردنەوە هەیە لەلایەن شارەزایانی زانستی دەنگەوە . من تەنیا بە
... منو بیرکردنەوەی خۆم گەیشتمە ئەم ئەنجامە ، هیوادارم شارەزایان
...تری لەسەر بڕۆن‌و زیاتر ڕوونی بکەنەوە .

جگە لەوە ، هەر لەبارەی بەپیزیی زمانی کوردییەوە ، زۆر وشە هەن
... ئەتوانرێت بە یەك بڕگە ، یان بە دوو بڕگە بوترێت بە پیی پیویست ،
...ێت : (سەوز ، کەسك) زۆر وشەش هەن کە ئەتوانرێت بە دوو بڕگە یان
...سێ بڕگە بوترێت ، وەك ، (فرمێسك ، بێکلك) .

ئێستا بۆمان دەرکەوت کە لە هەڵبەستی کوردی‌دا گرنگ ژمارەی
...گەکانە لە هەنگاوەکان‌دا بێ گوێدانە درێژی‌و کورتی بڕگەکان چونکە لە
...نەوەوەو لەووتنی هەنگاوەکاندا ئەو درێژی‌و کورتیە چارەسەر
...کرێت ، بە هۆی بەپیزیی زمانەکەوە . واتا مفاعلین‌و فاعلاتوو
...ستفعلن‌و .. هتد وەکو یەکیان لێ دێتەوە لە ئەنجام‌دا وەك نموونەی
...ەمی هونراوەکەی سەرەوە . وەك هەزاران هەڵبەستی تری کێش پەنجە .
...ە ئەتوانرێت هەڵبەستێکی کوردی لەسەر کێشی عەروز بکرێت بە
...ج خشتەکی لەسەرکێشی پەنجە چونکە کە هەستیار بۆی هەبێت ، بە
...ی کیشی پەنجە ، بەرامبەر ، بۆنموونە ، مفاعلین : فاعلاتن ،
...عولاتو ، مەفعەلاتو ، مفاعیلو ،مستفعلن ، هتد بلێت‌و لە ئەنجامیش‌دا
هەموویان یەك سان بوەستێنەوە ئیتر بۆچی ئەبێ نەتوانیت ئەو پێنج
...تەکیە بلێت بەو جۆرە ؟ ! خۆ ئەوکارەش لەو سنوورە تێپەڕ ناکات ..
...ە پینج خشتەکیەکەی منیش لەسەر هەڵبەستەکەی کوردی (ئەمان
...ە عیلاجی) ڕاستەو دروستەو ئاسمان‌وڕیسمانیان بەین نیەو لەگەڵ زەوق‌و
...حی کوردەواری‌دا ئەگونجێت . مەگەر موچرکی بێ لەزەتی‌و بێ زەوق
...دەمانەدا بینێت کە «گڵی دوور بە دەرمان ئەزانن ! !» ومیزاجی
...ردەوارییان تێکچوە !

منیش ئەڵێم ڕاستە لە هەڵبەستێکی عەرەبی دا کاری وا ڕەت
...کرێتەوە. بەڵام لە هەڵبەستی کوردی‌دا ڕەت ناکرێتەوە. خۆم من
هەڵبەستم بە عەرەبی نەوتوە . ئیتر بۆچی ئەبێ بە ترازووی عەروز مامەڵەم
...گەڵدا بکرێت . با هەڵبەستەکەی کوردیش بەکێشی عەروز وترا بێت .
هەڵبەستەکەی کوردی کێشی پەنجەی کوردیش هەر ئەیگرێتە خۆی‌و پیی

ئەڵێت کێشی (١٦) بڕگەیی .

لەڕاستیش دا هەر زمانێك‌و هەر نەتەوەیەك پێناسەیەك‌و ترازوویەکیان هەیە بو هەڵبەست کە ئەشێ جیاواز بێت لەهی نەتەوەکانی تر . بۆ نموونە : یونانیەکان پێناسەیەکی سەیرو ئەندێشە ئامێزیان هەیە بۆ هەڵبەست‌و ئەڵێن : «هەڵبەست عەرەبانەیەکە دوو ئەسپی ڕازاوە ڕای‌ئەکێشێت ، ئەندیشەو هەست ، پیاوێکی دانا لێی ئەخورێت کە ژیرێتییە ، ئەم عەرەبانەیەش بەسەر هەوردا ئەڕوات»[٥] هەروەها ، بۆ نموونە ، عەرەب‌و کورد ، گرنگی بەلایەنی ساز (موسیقا) ئەدەن (کێش‌و سەروا بەڵام یونان گرنگی بە ئەندیشەو سۆزو ژیریتی ئەدەن وەك یەك . لایەنی سازیان بەتەواوەتی پشت‌گوێ خستوە .[٦]

٢ لەم خاڵەدا ئەگەڕێینەوە سەر بەڵگەی باوەڕهێنەری دووەم . بەڵام جارێ ئەمەوێ بڵێم کە ئەگەر فێر بوونی بنەما گشتییەکانی عەروز ، لەسەر دەمێك‌دا ، وانەیەکی گران بووبێت ، ئەوا ئێستا بە هۆی ئەوەوە کە بڕگەی‌کورت‌و درێژ ، بۆتە جێگری سەبەب‌و وەتە دو تێکراکێشانی هەنگاوەکان ، ئیتر فێربوونی عەروز کارێکی ئەوەندە گران نیە ، بەڵکو ئێستا ئەتوانین بڵێین بنەما سەرەکیەکانی عەروز بریتیە لەم ڕستەیە : (دیاری‌کردنی شوێنی بزوان‌و نەبزوان لە وشەدا) ئیتر هەر چی‌تر وتراوە ئەوە تەواو کەری ئەم ڕستەیەیە .

لەم بارەیەوە دوکتور ممدوح حقی ، مامۆستای عەروزو ئەدەب لە کولێجی زانستی دمشق ئەڵێت : (خاوەنی سروشتێکی موسیقی پێویستی بە خوێندنی عەروز نیە)[٧] . کەواتە کێشەکە ئەوەندە گەورە نیە وەك ئەم برادەرە : ع . ب (کاوە فیدا) ئەیەوێت لامانی گەورەکات ! ! . سەفیەدینی حلیش هەموو دەریاکانی عەروزی لەنیو لاپەرەدا کۆ کردۆتەوە .[٨]

لەبەر ئەوە ، لەبارەی بەڵگەی دووەمەوە ، من بەم نموونە هونراوە عەروز یانەی خۆم ئەڵێم وەڵامی ئەو برادەرە بدەنەوە ، وەك بەڵگەیەکی باوەڕهێنەر :

**یەکەم** : دوو بەیت لەهەڵبەستی (دایك) :

لە دایك‌دا چ خاوێنەو چ پیرۆز
دەمی کاتی بە قوربان‌و دەمی سۆز
پەڕو باڵی بە با داوی لەپێناو

سرەوتێکی جگەر گۆشەی بە جێماو
مفاعیلن مفاعیلن فعولان
ب -- ب--- ب--

**دووەم** : پارچەیەك لە هەڵبەستی : (جەژنی سی ساڵەی خۆشەویستی) :
شاپەڕی شێوەی مناڵیم ، وەی نموونەی شۆخی کوردی
پەیکەرێکی خامە ڕێژی هەستەکانم بۆ نەکردی ؟
ئەی لەئەنجاما بەسەر دەستی منا بۆ ڕانەبوردی ؟
تا بڵێم ئۆخەی ئەشێلێ پەنجەکانم وا بەوردی
ڕەنجی فەرهادم بە با چوو ، نارەوا بەدکاری بردی !
ڕەنجی فەرهادم بەبا چوو ، هەی دڵی گێل بۆ نەمردی ؟
فاعلاتن × ٤
- ب - - × ٤

**سێیەم** : پارچەیەك لە هەڵبەستی : (تالاوی ژوان) :
ئەبێ هۆ چی بێ ! نموونەی بەرزی
بەڵێن پەروەری ، نازەنینەکەم
ئەم جارە نەهات ! ؟
چ کارە ساتێ ئەشێ ڕووی دابێ
لە دەورو بەری ، بێ بەمایە خەم
ناچارە نەهات !

ئەمەیان لەسەر بنەمای برگەی کورت و درێژ هاتووە بەم جۆرە : (ب - ب - -) ، (ب - - -) ، (ب - - ب -) ، (- ب - ب -) ، (- - ب ب -) . کە هەموو هەڵبەستەکە بەو جۆرەیە .

هەر بەم بۆنەیەوە ، ئەمەوێ ئەم هەڵە عەروزییانە بۆ برادەری ڕەخنەگر ڕاستبکەمەوە کە لەوتارەکەی هاوکاریی ناوبراودا تووشیان هاتووە . ئەویش کێشانەی هەندێك لە هەنگاوەکانی پێنج خشتەکیە کە بوو کە بەهەڵە کێشابوونی ! ! من لێرەدا ڕاستەکانی لەپاڵدا ئەنووسم :

| هەنگاوەکان | کێشانە هەڵەکان | ڕاستکردنەوەکانیان |
|---|---|---|
| ئەوەندە مەس | مفاعیلن | مستفعلن |
| سەر ژماری | مفاعیلن | فاعلاتو |
| ڕێ دەروونی | مفاعیلن | فعلاتن |
| لەدنیادا | فاعلاتو | مفاعیلن |
| شکۆ دارە | مفاعیلن | مفاعیلو |

لە کۆتاییدا ئەمەوێ ئەو ڕاستیەش بدرکێنم کە هەر چەندە کێشی پەنجە لەڕووی موسیقاوە لەگەڵ زمانو هەڵبەستی کوردیدا گونجاوە . بەڵام کێشی عەروز ، یان ڕەچاوکردنی برگەی کورت و برگەی درێژ ، پیشەکارییەکی زیاتری تێدایەو ڕازاندنەوەیەکی زیاتر ئەدات بە هەڵبەست .

لەبارەی یەکێتی باسەوە ، کەبرادەری ڕەخنەگر پەنجەیەکی بۆ درێژ کردبوو لە وتارەکەیدا ، بە پێویستی نازانم لەو بارەیەوە شتێك بڵێم ، چونکە ئەو یەکێتیباسە لەپێنج خشتەکیەکەدا هەیەو خوێنەرەوە بە ئاسانی هەستی پێ ئەکات .

پەراوێزەکان :
١ - بو شیعرو شاعیر ، من هەڵبەست و هەستیار بەڕاست ئەزانم . لە وتارێکی تایبەتیدا ، بەدرێژی لەم بارەیەوە ئەدوێم .
٢ - ویکون التجاوز - ل٩
٣ - هەمان سەرچاوە - ل ١٠ ، ١١
٤ - لەم وتارەدا هەموو نموونەکان لەهەڵبەستی گۆران ئەهێنمەوە ، چونکە ئەو شارەزاو هەستیاری هەردوو کێشەکە بووە .
٥ - العروض الواضح - ل ١٤
٦ هەمان سەرچاوە - ل ١٤
٧ - هەمان سەرچاوە - ل ٥
٨ - المنجد - ل ٣٨٩

ئەم سەرچاوانە سوودیان لێوەرگیراوە :
١ - احمد هەردی - کێش لە شیعری کوردیدا - گوڤاری برایەتی (١٠) ساڵی ١٩٧١
٢ - محمد الجزائري - ویکون التجاوز - منشورات وزارة الأعلام العراقیة - دار الحریة للطباعة والنشر ١٩٧٤
٣ - د . ممدوح حقي - العروض الواضح - دار الیقظة العربیة - بیروت ١٩٦٤
٤ - دیوانی گۆران - چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق ١٩٨٠
٥ - عبد الرزاق بیمار عەروز لەهەڵبەستی کوردیدا - گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ (١١٣) ساڵی ١٩٨٧ .





# ڕوون کردنەوەیەك لەسەر مەلا غەفوری دەباغی

کاوە فیدا

ـوسـین و لێکـۆڵینـەوە لەسـەر ژیـان و سـەربردەو بەرهەمی ـووسـەرو ئەدیب و شاعـیرانمـان کارێکی پیرۆزو بەجێیـەو جێگـای بایەخ پێدان و لێ ورد بوونەوەیە لەسەر بناخەیەکی ـ ست و درووست و بێ پێچ و پەنا .

ـپێویستە لەسەر نووسەران تادەکرێ بە ئەمانەتەوە دەست لەو جۆرە کارانە بدەن و لە پێناو ئەوەی خوێنەری ئەمرۆو نەوەی دوا ـڕۆژمان چەواشەو سەر لێ شێواو نەبێ هەر ڕاستی‌یەکی کە لەو ـرمیـەوە هەیـە بخـرێتە بەر چاو و بەو هۆیەشەوە دەتوانرێ خزمەتێکی چاك بەزمان و ئەدەبی گەلەکەمان بکرێ .

ـئەوەی لێرەدا مەبـەستمـەو دەمـەوێ پەنجـەی بۆ ڕابکێشم ـلێکـۆڵینـەوەکـەی مامـۆستـا سەعیـد شێخ عەلی [س . ع . ـشادمان]ە کە لە بارەی [مەلا غەفوری دەباغی] یەوە لە ژمارە «٦١»ی ئەم گۆڤارە هێژایەدا بڵاو کراوە تەوەو نووسەری ناوبراو چەنـد ڕاستی‌یـەکی کردووە بەژێر لێوەوە چەند هەڵەیەکیش کەوتۆتە نوسینەکەیەوە کە پێویستیان بەڕاست کردنەوە هەیە ، لێرەدا بەپێی ئەو ئاگـادارییـەی کە لەبارەی مەلا غەفورەوە دەست گیرم بووەو لەکـاتی خۆیدا بەچەند دێرێك لە ژێرناوی [یـادێ لە شاعـیرێ] لە ژمـارە «٤٩»ی هەمـان گۆڤـاردا بەخوێنەرانم ناساندووەو ئێستاش دیوانی چاپ کراویم لەبەر دەست دایەو بەپشتیوانی دیوانەکەو ئەو کاسێتە تۆمار کراوەی کەبـە دەنگی خودی مەلا غەفـورەو باسی ژیانی خۆی دەکات لێرەدا پەنجـە بۆ هەڵەکـانی مامـۆستـا «س . ع . شادمان» ڕادەکێشم و بۆ خوێنەرانی بەڕێزی ڕوون دەکەمەوە ، بەهیوای ئەوەی خزمەتێك بێت بە ئەدەبی کوردی .

مامۆستا شادمان لەسەرەتادا نوسیویەتی : [لەتەمەنی حەوت ساڵی‌یەوە بەنەخۆشی ئاوڵە هەردوو چاوەکانی کوێر بووە] .

یان بۆ شوێنی لەدایـك بوونی دەڵێ [لەیەکێ لە دێهاتەکانی کوردستان چاوی هەڵ هێناوە] .

هەردووك بۆ چوونەكەی نووسەر هەڵەن و ئێستا گوێ لە مەلا غەفور دەگرین بزانین دەڵێ چی ؟!

[نێوم غەفور كوڕی دەروێش عەبدوڵلا لەساڵی ١٣٤٦ی كۆچی لەشاری «سەقز» لەدایك بووم ، دوای ساڵ و نیوێك باوكم ماڵی چووە بۆ بانەو لەوێ خەریكی كەسپی دەباغ چێتی بووە ، ئالەو كاتەدا بۆ چەرم كرین هاتووە بۆ مەهاباد ولەو ماوەیەدا كە بابم دەســـەفـەر دابووە ئازاری خرۆێلكە لەبانە پەیدا بووە منیش لەبـەرئـەوەی كەس نەبووە بم كوتێ تووشی ئەو ئازارە بووم .

هەرچـۆنـی بووە ئەو هەواڵەیـان بە باوكـم داوە ئەو زەمـان حەكیمێكی عروسـان لەمەهابادێ بووە گوایە دەرمانێكی بووە گەیاندبایە هەر چاوێك لەكوێر بوون رزگار دەبوو مسقاڵی ئەو دەرمانە بە لیرەیەك و لیرەش ئەو كات «٢٨» قران بووە .

باوكیشم بەپەلە مسقاڵێك لەو دەرمانە دەكرێ‌و بە كارواندا دەی نێرێتەوە بەڵام ئەو پیاوەی دەرمانەكەی منی پێ بوو لەسەقزی گیروگرفتێكی بۆدێتە پێش و نۆ رۆژان لەوێ ماتڵ دەبێ ، داخی داخانم وەختایەكی دەگاتەوە بانە من بینایم لەدەست داوە ، ئەو چاوانەی هیوای دوا رۆژی من بوون ....] .

بەڵێ ئەمـە قسـەی مەلا غەفور خۆیەتی‌و ئیدی نەلە دێ‌هات لەدایك بووەو نەلە تەمەنی حەوت ساڵیدا كوێر بووە .

لەبـەشێكی دیكـەدا شادمـان دەڵێ :ـ [لەلای مەلا حسینی مەجدی عەروزو قافیەو هەندێ تەفسیری قورئان و شەرع و عیلمی خوێندووە] .

لێرەشـدا ماف چەنـد مەلاو زانـایـەكی دیكـەی سڕیـوەتـەوە كەدەرسیان بەمەلا غەفور گوتووەو خۆی دەڵێ :ـ [لەلای مەلا حسینی مەجـدی هێندێكم عەروزو قافیەو لەلای حاجی مەلا خالیـدی وەحیـدی دەربەندی هێندێكم شەرع و لەلای قازی محەمدی خزری لە شنۆیە هێندێك شەرع و عەقایدم خوێند] .

ئینجا دێتە سەر ژیان و گوزەرانی شاعیرو دەڵێ :ـ [ئەم شاعیرە كوێرە بەهرە مەندەمان دەستی لەكەس پان نەكردۆتەوە ، دێ بەدێ گەراوەو وردەواڵەی فرۆشتووەو ...] .

كاك شادمان لێرەدا راستی‌یەكی شاردۆتەوە كە مەلا غەفور بۆ خۆی ئیعتـیـرافی پێ كردووەو بەشـەرمی نەزانیـوە ، ئەویش مەسـەلەی دەست پان كردنەوەیە ، ئەوەتا لێرەدا مەلا غەفور




دانی پێـدا دەنێ و دەڵێ :ـ [پاش بیست ساڵ ژیان لە شاری سابلاغ بە هۆی گیروگرفتی ژیان باوكم ناچار بوو بەرەو بانە بگەرێتەوەو منیش تەنیا لێرە مامەوە پەردەی تاڵی ژیانم لێرەدا تاریـك و لیـل تر بوو ،نـاخافڵ لێم قەوماو لە باوكم هەڵبرام ، بەداخەوە لەوڵاتی مەماناندا ئینسانی كوێر مەحكومە بە سواڵ كردن ژیانی بەرێتە سەر ، بەڵام ئەمن دوو مانگ بە سیغارو بلیتی بەختی ئازمـائی فرۆشتن رام بوارد بەڵام داخی گرانم ئەوی هەشم بوو بەدەستمەوە نەما چونكی ئی وا هەبوو بلیتی كۆنی دەدامێ و بەتـازە لێی دەگـۆڕیمەوە هیچ چارم نەمابوو لەگەڵ تاقمێكی دی لەحافزان چوومە دەرەوە بۆ گەران ، جاری ئەوەڵم بوو زۆرم لەبـەر گران بوو دەست پان كەمەوەو داوای خێرو ئیحسان بكەم هەر لەبەر ئەوە ئەوانەی لەگەڵم بوون بۆیان داوا دەكردم . ناخۆشترین دەورانی ژیانم دەستی پێ‌كرد ، هەر شەوەی لەدێیەك و لەمزگەوتە كۆنێك دەمانەوە ، بەخرابترین جاجم و لێفەی كۆن و پیس دەنوستین ، تا حەوتوومان لێ تێ‌وەر دەسووراوە لەبەر چڵك و رشك و ئەسپێ‌یان ئۆقرەمان لێ دەبرا ، دەردی چاو ساغیش سەرەرای هەموو دەردان بوو لەگەڵمان رێك

نەدمکەوتن
ئەوەی پەیدامان دەکرد دەبوو لەگەڵمان نیوە کردبان ....]
کارێـك کە خاوەنەکەی پێی شەرم نەبێ بیگێڕێتەوە ئیدی بۆ دەبێ پەردەی بەسەر هەڵکێشرێو لەخوێنەرو مێژووی ئەدەب بشار درێتەوە ؟!

لەجێگایەکی دیکەدا نووسەر دەڵێ: [ئەم شاعیرەمان ئێستاش لەژیانا ماوەو پیر بووەو «سێ چوار کوڕی هەیە» نایەڵن کاسبی بکات بەخێوی ئەکەن ...]

لەپێشــەکی دیوانە چاپکراوەکەیدا شاعیر بەتێرو تەسەلی باسی هەموو قۆناخ و لایەنەکانی ژیانی خۆی دەکات و بەڵام بەهیچ جۆرێك باسی ژن هێنان و خاوەن ماڵ و منداڵی نەکردووە ،نازانین کاك شادمان لەچ سەرچاوەیەکی وەرگرتووە کە سێ چوار کوڕی هەیــە ،ئــەی ئەگەر کوڕی هەیەو نایەڵن کاسبی بکات بۆچی کۆکــەرەوەی دیــوانەکەی [ڕەسوڵی ڕەش ئەحمەدی] لەکۆتایی پێشەکییەکەیدا دەڵێ: [ڕێزی پلەو پایەی ئەو شاعیرە بگرین و نەهێڵین لەوەی زیـاتر بەدەست تەنگیو هەژاری ژیان بەرێتە سەر ].

ئەمــە ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کەمەلا غەفور کاسب کارو بەخێو کاری تەنها خۆیەتی بۆیە کۆکەرەوەی دیوانەکەی داوا لە دڵســۆزان دەکـات کەیارمەتی بدەن و نەهێڵن لەوەی زیاتر بەدەست تەنگیو هەژاری ژیان بەرێتە سەر .

ئینجا هاتووە چەند شیعرێکی بڵاو کردۆتەوەو بەئارەزووی خۆی لەشیعرێکی دوورو درێژ چەند بەیتێکی هەڵبژاردووەو ئاماژەی ئەوەشی نەکردووە کەئەم شیعرە ئەوەندە بەیتەو من تەنها ئەم چەند بەیتەم لێ هەڵبژاردووە ، خوێنەر وا دەزانێ کەشیعرەکە لە ئەسڵدا هەر ئەوەندە یەو بێ کەم و کوڕییە.

لەراستیدا پارچــە شیعــری یەکــەم کەلە دیوانەکەیدا لەژێر سەردێری [ستایش بۆ یەزدانی مەزن]دا بڵاو کراوەتەوە «٤٦» بەیتی تەواوەو ئەم تەنها «١٣» بەیتی ناو بەناو دەر هێناوەو بڵاو کردۆتەوە .

لە پارچەیەکی تردا کە بەناوی [سکاڵا نامە] وەیە لەدیوانەکەی دا «١٥» بەیتەو لای ئەو «٨» بەیت بڵاو کراوەتەوە .

لەدوا شیعردا کەلە دیوانەکەیدا لەژێر ناوی [کچی بۆکان]دا چاپ کراوە هەمــان کەم و کوورتی بەدی دەکـرێو شیعرەکە لەئــەسڵدا «٢٥» بەیتــەو شادمــان تەنهــا «١١» بەیتی بڵاو کردۆتەوە .

ئەمە جگە لەوەی کەدەسکاری چەند وشەیەکیشی کردووە وەکو :ـ نیوە دێری دووەمی بەیتی یەکەمی بەم جۆرە نوسیوە :ـ

**[شەهێنێ، دلڕفێنێ، خەم رەوێنێ ،روو گەشی جوانی**
**حەسود کوێر بێ لە«ئاستت»ئەی کچی نازداری«بۆتانی»]**

ڕاستییەکەی بەم جۆرەیە :ـ

**حەسود کوێر بێ لە «حاندت» ئەی کچی نازداری «بۆکانی»**

بەیتی هەشتەم نیوە دێری دووەم وشەی [دەستم]ی کردووە بە [دەمم] . سەرەرای ئەوەش لە نوسینــەوەی شیعــرەکـانیشدا لەرووی رێنوسەوە کەوتۆتە هەڵەوە وەکو:ـ [ دلڕفێن ، لەشۆخو شەنگیـا، رق و قین، خەتو خاڵ، لەش و گیان ] کە راستییە کەیان بەم حۆرە دەنوسرێن : [ دڵ رفێن ، لە شۆخ و شەنگی یا، رق و قین، خەت و خاڵ ، لەش و گیان ] .

دواجار پێویستە ئەوەش بڵێین کە مامۆستا شادمان سەرچاوەی ئەو باســەی دیــاری نەکــردووەو بەم کارەش یەکێك لەمەرجە سەرەکییەکانی نووسینی فەرامۆش کردووە .

بەهــەر حاڵ هیــوای بەردەوامیو سەرکــەوتن بۆ مامــۆستــای نووسەر دەخوازم و ئومێد دەکەم کەلە سەرنجە کانم دڵ گران نەبێت چونکە مەبەستی هەموو لایەکمان تەنها خزمەت کردنی زمان و ئەدەبی گەلەکەمانەو هیچی تر . ڕێزی بێ پایانیشم بۆ گۆڤاری کاروان کە گرنگیەکی لەرادە بەدەر بە ئەدەبی کۆن و نوێی نەتەوەکەمان دەداو لاپەرەکانی ئاوەڵا کردۆتەوە بۆ وشەی جوانی کوردی ،بەهیواین هەر بەردەوام و سەرکەوتوو بێت .

## سەرچاوە


★ دیاری مەهاباد لە هەڵبەستە پڕ مەبەستە کانی مەلا غەفوری حافزی مەهــابادی .. کۆکراوەی ڕەسوڵی ڕەش ئەحمەدی ـ چاپەمەنی سەیدیان ١٣٦٣

★ کاسێتێکی تۆمــار کراو بەدەنگی مەلا غەفــور کەلەبــرای بەرێز کاك «خالیدی حسێنی» م وەرگرتووە .




# خەرمانلۆغەو تێڕوانینێکی ڕەخنەگرانە

● ئیسماعیل تەنیا●

ئەگەر بە تیلەی چاوێکیش بێت سەرنج بدەینە کتێبخانەی کوردی ، بە تایبەتی ئەو بەشەی کە بۆ منداڵان نووسراوە ، دەبینین یەکجار هەژارە لە چاو بەشەکانی تری ئەدەبی کوردی ، هەر چەندە ئێستاکە لە جاران باشترەو نووسەران بایەخیان بەم بابەتە داوە ، چ بە نووسینی خۆماڵی یاخود وەرگێران بەشداری دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی منداڵانیان کردووە . ئێمە کە دەڵێین لەم لایەنەدا هەژارین مەبەستمان ئەوە نییە هەر کەسێ بێت و قەڵەم و دەفتەر بگرێتە دەست و چی بە بیریدا هات بینووسێ‌و بە هەوەنتەو ناهەقیش مۆری ئەدەبی منداڵانی لێبدات و لەسەر ئەم بەشە گرنگەدا حسێب بکرێت . نەخێر ئێمە زۆری‌و بۆری ، یاخود چەندایە تیمان مەبەست نییە بە قەدەر ئەوەی کە چۆنایەتیمان مەبەستە . هەر لەو پێ‌و دانگەش دەروانینە دوا بەرهەمی کاک « ئیبراهیم ئەحمەد شوان » ی شاعیر هیوادارین بتوانین لایەنە گەشە دارو چاکەکان لە گەڵ لایەنە هاودژەکەی هاوێر بکەین و دەستنیشانی خاڵە لاوازەکان بکەین بە مەبەستی زێتر گەشانەوە وچرۆ کردنی ئەم بەشە گرنگەی ئەدەبی کوردیمان .

« خەرمانلۆغە » بریتی‌یە لە کۆمەڵە شیعرێك بۆ منداڵان نووسراوە ، قەبارەکەی «٦٠» لاپەڕەیەو لە چاپخانەی «رۆشنبیری و لاوان ـ هەولێر» ساڵی « ١٩٨٥ » چاپکراوە . ئەم کتێبە سێ‌یەم بەرهەمی شێوە کتێبی شاعیری ناوبراوە . لە ڕووی ناوەرۆکەوە رادەیەك باشەو لە خزمەتی منداڵان دایە ، شاعیر هەوڵی داوە پەروەردەیەکی دروست لە ڕێگای شیعرەکانەوە بداتە منداڵانەوە ، هانیان دەدات تێبکۆشن و کاری ئەمڕۆیان نەخەنە بەیانی و نیشتمان و خاکەکەی خۆیانیان خۆش بوێ هەروەها ڕێزی زانست و زانیاری بگرن و هەموو هەولێکیان لە پێناو پێگەیاندنی خۆیان بێت تا لە دوا ڕۆژدا بێنە مەیدان و چالاکانە بەشداری بکەن لە خزمەت کردنی گەل و نیشتمانەکەیان . لە ڕووی تەندروستی‌یەوە هانی قوتابیان دەدات شتی سەر دانەپۆشراو لە فرۆشیارە گەڕۆکەکان نەکڕن چونکە هیچ مەرجێکی تەندروستیان تێدا ڕەچاو نەکراوە . سەرەرای گرنگی دان بە پاك و خاوینی ئەندامەکانی لەش و جل و بەرگ و ڕەوشتی ڕێگاو بان و ڕاستگۆیی و دەست پاکی‌و ... تاد شاعیر سەرکەوتووانە توانیوویەتی چەند ووشەیەکی وەکو « بزگور ، هەراش ، نیوڕان ، نادین ، کشت ، ... تاد » بئاخنێتە نێو دێری شیعرەکانەوەو منداڵان بەم ووشانە ئاشنا بکات ، کە دانیشتووانی ناوچەی هەولێر لە گفت و گۆ کردندا بە کاری دەهێنن .

★ کاك « ئیبراهیم » چەند ووشەیەکی وەکو « شنگ ، وامی ژین کادو ، پەیك ، تەلاش ، ئۆقرەگاهی ، مێردەزمە ، ئاسایش ، ترایش ، هەمباز ، .... تاد » بەکار هێناوە کە زۆر گرانن بە نیسبەت منداڵەوە ، ئەوەی بیەوێ لەم لایەنە بنووسێ دەبێ شارەزاییەکی باشی باری سایکۆلۆژیو زمانەوانی منداڵ بێت چونکە مادام بەرهەمەکە بۆ ئەوان نووسراوە دەبێ لە مەداری جیهانە بەرفراوانەکەی ئەوانەوە بخولێتەوە نەك هەمبازێك بدات و لە ئاقاری ئەوانەوە دەربچێت . سەر باری ئەم ووشە گرانانەش چەند ووشەیەکی رەزا قورسی بە زۆر کراو بە کوردی وەکو « قوتابگە ، پەرتووك » بەکار هێناوە کە زۆر لە مێژە نووسەرانی کورد رەفزی ئەم جۆرە وزوشانەیان کردووەو بە ووشەیەکی داتاشراویان لە قەڵەم داوە کاك « ئیبراهیم » لە جیاتی بەکار هێنانی ئەم ووشە داتاشراوەنە دەیتوانی ووشەی تر بەکار بهێنێ کە لە ئەدەبی کوردیدا دەقی گرتووەو شوێنی گونجاوی خۆی کردوتەوە . هەروەها دەیتوانی ئەم ووشە عەرەبیانەی وەکو « ئەرز ، زەرەر ، قسور نیعمەت ، ... تاد » بەکار بهێنێ .

★ باشتر وابوو لە کۆتایی کتێبەکەدا فەرهەنگۆکێکی بچکۆڵەی بۆ بکردایە چونکە زۆر ووشەی گران هەیەو پێوویستی بە لێکدانەوە هەیە بە تایبەتی ناونیشانی کتێبەکە « خەرمانلۆغە» کە نەوەی ئەمرۆ کەمێکی « لادێییەکان » نەبێ دەنا شارنیشینەکان هەر هیچی لە بارەوە نازانن .

★ ئەگەر چاپەکە بە پیتی چاپ بنووسرا بووایە باشتر دەبوو لەو نووسینەی ئێستای کە دەستنووسە چونکە کاکی «خۆشنووس» شێوە فەنتازییەکی لە نووسینەکەی بەکار هێناوە کە بە زەحمەت بۆ منداڵان دەخوێندرێتەوە بە تایبەتی ئەو قوتابیانەی لە قۆناغی سەرەتایی دان . چەند پیتێك شێوە نووسینەکەی زۆر نادیارە بە تایبەتی پێتەکانی « گ ، ك ، ە ، ن » ئەگەر پێتی چاپ بووایە ئەم ئاستەنگەش نەدەهاتە رێ ، ئەگەر کاك « ئیبراهیم » یش بۆ سوککردنی کرێو ئەرکی چاپ ئەمەی کردووە ، ئەوا ئێمە لەگەڵ ئەودا نین چونکە ئەمیندارێتی رۆشنبیری و لاوان یارمەتی داوە بۆ بە چاپ گەیاندنی .

★ کاك « ئیبراهیم » لە شیعری « زستان » دا دەڵێ:

هەموو لەشمان رەق دەکاتن
بەرەو خەستەمان دەباتن . ل ٨

شاعیر هەر رووە گرژو مۆنەکەی زستانی نیشان داوە . نەدەبوو بەو شێوەیە زستان بە منداڵان بناسێنێ کە رەقیان لێ ببێتەوەو نەیانەوێ بە دیداری شاد بن . ئەدی هەر لە وەرزی زستان نی یە بەفرو بارنێکی زۆر دەبارێو بەرەنجامەکەشی دەغڵ و دان و بەروو بوومی دەیان میوە پێ دەگات ؟! کە مرۆڤ لە رێگای ئەمانەوە زۆربەی هەرە زۆری پێویستیەکانی ژیانی مەیسەر دەکات ، هەر بەرەنجامی ئەم بارانەشە کە مرۆڤ گرنگترین هۆکاری ژیانی کە « گەنم »ە دەستگیر دەبێت بە تایبەتی لە کۆمەڵگای ئێمەدا . سەرەرای ئەوەش منداڵی کورد خۆی فێرە سەرماو سۆڵەو ژیانی ناو بەفرە چونکە هەڵکەوتنی شوێنی جوگرافی خاکەکەی و سەختی ژیان فێرە راهاتنی کردووە لەگەڵ ئەم زریان و رووداوە سروشتییانە . بێجگە لەمەش منداڵی کورد حەز بە باران دەکات ئەم راستیەش لەم شیعرە فۆلکۆرییەوە رەنگ دەداتەوە کە ساڵی بێ بارانی منداڵان کۆمەڵ کۆمەڵ دەگەرێن و هەموو بە یەك دەنگ دەڵێن:

**هەیاران و مەیاران**
**یاخوا دەکاتە باران**
**بۆ فەقیرو هەژاران.**

★ ئەوساکە بە هێمنی دەخۆم نانی بەیانی . ل ١٠ لە رووی ئاوازی مۆسیقاوە ئەم جۆرە سەروایە «بیژۆکە» چونکە ووشەی «هێمنی» و «بەیانی» یەك ئاوازیان نی یە . دەبووایە دوو ووشەی هاو ئاواز بوونایە .

★ ئەم دێرانەماناکەیان زۆر بە زەحمەت دەگاتە مێشکی منداڵەوە چونکە رەمزو تەم و مژێکی تێدایە ، زێتر پێویستی بە مێشك گوشین هەیە هەتا دەگاتە ئەنجامێك ، شاعیر لە بری ئەو رەمزانە دەیتوانی بە شێوەیەکی ساکارو بێ گرێو گۆڵ بیرەکەی دابرێژتایە تاکو بە زووترین کات و ماندو بوونێکی کەم ناوەرۆکەکەیان بۆ بەرجەستە بێ . نموونەی ئەم راستیەش ئەم دێرانەیە :

**- لە پێناوی بوون و مانمان سواری بیری ئازاد هەستا.ڵ**
**- نەك ئەوەی تۆوی پیسی دەچێنێ پەرەی بێ گەردی بیر دەگەچرێنێ . ل ١٧**
**- بینە خاوەن دەخیلە دیلی نەفسیش هەر دیلە . ل ٥٧**
شاعیر چەند پەندێکی پێشینانی لگەڵ شیعرەکان تێهەڵکێش کردووە کە لێرەدا بۆ مندالان لە جێی خۆیدا نی‌یە چونکە پەندی پێشینان ماناکەی هێندە روون نیە نەخوازەلا بە نیسبەت منداڵەوە . هەر چەندە دەزانم شاعیر مەبەستی ئاشنا کردنی مندالانە بە کەلەپووری نەتەوایەتیمان بەلام ئەم بۆ چوونانە دوورە لە بیرو لێکدانەوەو خولیای منداڵ . بۆ نموونە لە شیعری «کۆتایی ساڵ» دا هاتووە :

**دژی تەمەنی خۆ بێ «شەر لە تۆ نەك لە شۆ بێ» ل ١٩**

**یان دەڵێ :**

**کەوا ئەو نانە نانە لەبەر چەنگەو لە خوانە . ل ٥١ .**

★ لە زۆر شوێندا زۆر دێرە شیعر ماناکەیان فراوان نی‌یەو بە زۆر لە خۆکردن داڕێژراون ، هەر ئەمەشە بۆتە هۆی ناتەواوی‌و بێهێزی دێرە شیعرەکان ، بۆ نموونە ئەم دێرانە دەخەینە روو. شاعیر لە شیعری «سروودی مندالێکی کوردی ئێرانی» دا دەڵێ :

**ئێستا کەوا لە ناو نازوو**
**نیعمەت دەژین بە تەرازوو. ل ١٥**

یان دەڵێ:

**هیوا قۆپیە کرێتە**
**چالی سەر چەقی رێتە. ل ٢٥**

یان لە شیعرێکی تردا دەڵێ:

**وەرزش لە شتان بەتین دەکا**
**وەرزش پیاوتان لێ شین دەکا . ل ٣٩**

**★ بەزیویش چەلەو داری بێ بەرە**
**مردۆخەو نانخۆرێکی جێگیرە . ل ١٨**

لە نیوە دێری یەکەم کێشی مۆسیقا تەواوە ، راوەستانی تێدایە .

بەلام نیوە دێری دووەم منداڵ تووشی هەناسە سواری دەکات چونکە ئەم نیوە دێرە هیچ راوەستانێکی تێدا نی‌یە .

★ نەدەبووایە شاعیر ووشەی « مەهتوك ، مردۆخ ، کەودەنی » بەکار بهێنابووایە چونکە شیعر هێندە ناسك و جوانە شوێنی ئەم ووشە ناشیرینانەی تێدا نابێتەوە ، نەخوازەلا شیعرێك بۆ یەکێك بنووسرێ کە فەرهەنگەکەی خالی بێت لەم جۆرە ووشانە .

**★ هەر کەسێ نرخی تەمەن نەزانی**
**بێ گومان گێلەو سووکە ( بەزانی ) . ل ١٨ .**

راستی‌یەکەی « بەزاند » ە ، بەلام لەبەر سەرواوای بەسەر هاتووە.

**★ گوناهی خۆی لە ئەستۆی با دەست بگرێتە « لە » ئەژنۆی . ل ٢٠ .**

نیوە دێری یەکەم حەوت «٧» برگەیەو نیوەی دووەم هەشت «٨» برگەیەو بۆتە هۆی لەنگ بوونی شیعرەکە . ئەگەر « لە » لابردرایە کێشەکە تەواو دەبوو ، هیچ لە ماناکەشی دەگۆڕی .

**★ هیوا بۆ وا تە نەنگاوی**
**وا دەرۆی بە هەشتاوی . ل ٢٤**

نیوە دێری یەکەم هەشت «٨» برگەیەو نیوە دێری دووەم حەوت «٧» برگەیە « نە » زیادەیەو پیویست بە بوونی نیە ، سەرەرای ئەوەی کێشی شیعرەکەی لەنگ کردووە ماناکەشی شێواندووە .

**★ سروودن بۆ مافی خوراو**
**زەمینەن بۆ تیشکی هەتاو . ل ٢٢**

راستی‌یەکەی « زەمینەن » راستترە ، ئەمە هەڵەی چاپیش نیە چونکە بە دەست نووسراوە . کاك « ئیبراهیم » دەبووایە پێش چاپکردنی چەند جارێك بە دەستنووسەکەدا بچووبایەوە بۆ دڵنیا بوون لە بوختی نووسینەکە . پیتی « و » لە ووشەی « خوراو » بە پیتی « د » دەخوێندرێتەوە ، نەك هەر لەم شوێنە

بەڵکو لە زۆر شوێنی تر نادیارەو زیاتر لە پیتی « و » دەچێ.

★ چوە لای شوانی زگ سووتاو . ل ٢٧ .
وشەی « چووە » بە دوو « وو » دەنووسرێ نەك یەك واو « و » .

**★ تا توزەی هات تەپاندیان**
**جا بە تەرمەوە بردیان . ل ٢٨ .**

یەكەم : « توزە » نییەو « نوزە » یە.
دووەم : كە خوێنەر نیوە دێری دووەم دەخوێنێتەوە وا هەست دەكات بێجگە لە تەرمی گورگەكە شتێكی تریان لە گەڵ بردووە چونكە ووترا « جا بە تەرمەوە » یەكسەر هەست بە بردنی دوو شت دەكەین كەچی لە راستیدا هەر یەك شتەو ئەویش تەرمی « گورگ » ەكەیەو پێویستی بە « جا بە » نە دەكرد.

**★ خستیانە بەر سەگ و تورگ**
**لاشەی پیسی مامە گورگ . ل ٢٨**

ئەم دێــرە پاش و پێش بكـرابـوایــەو بەم شێـوەی خوارەوە دابرێژرایە ماناكەی ئاشكراتر دەبوو:

**لاشەی پیسی مامە گورگ**
**خستیانە بەر سەگ و تورگ .**
**★ خەو سووكم وەك خەو ی كەروێشك**
**بێ خۆ گنخاندن و باوێشك . ل ٢٩**

سەرتاپای شیعری « شەوو رۆژێكی قوتابی » هەمووی هەشت « ٨ » برگەییە كەچی ئەم دێرەی سەرەوە نۆ « ٩ » برگەیە . باشتر وابوو شیعرەكە هەمووی یەك كێش بووایە چونكە دوو كێش لە شیعرێكدا پەسەند نیەو جۆرە لەنگییەك بە شیعرەكە دەدات و ئاوازەكەی دەگۆرێ .

**★ خێزان بێ ئێوە وەك دەشتی چۆڵە**
**هەردەم باران و زریان و سوڵە . ل ٣٨**

لە ناوەرۆكی ئەم دێرەدا منداڵ وا تێدەگەیەندرێ كەوا هەموو سات و كاتێك لە دەشتی « چۆل » باوو باران و زریانە ، كەچی ئەمە راست نیە چونكە باوو باران و زریان مەرج نییە هەر لە دەشتی « چۆل » بێت .

**★ نە هورەی گەرماو سەرما**
**ناهێڵێ بێتە سەرما . ل ٥٤**

وشەی « هورە » تەنها لەگەڵ هاوین و گەرمی بەكار دێت . لە ناو كوردەواریدا دوو جۆر « با » مان هەیە كە « شەماڵ » و « هورە » یە . بۆ نمـوونـە ئەگەر هاوینان یەكێك گەرما بیبات و تووشی نەخۆشی بێت دەڵێن : « با » ی هورە بردوویەتی .

**★ من پۆلیسی هات و چۆم**
**چوست و كرو بێ دەرۆم . ل ٥٥**

نیوە دێری دووەم ماناكەی ئاشكرا نیە . ئەگەر شاعیر مەبەستی « بە پێ» رۆیشتنی پۆلیسی هات و چۆ بێ دەبـووایــە بڵێ : « چوست و كر بە پێ دەرۆم » .
★ هەر چەندە تا ئێستاكە نەبۆتە باو كە یەكێك كۆمەڵە شیعرێك بۆ منداڵان دەنووسێ دەست نیشانی قۆناغەكان بكات ، بەلام باشتـرو پێـویست وایــە كۆمــەڵە شیعـرەكان لە یەكتر جودا بكرێنەوەو دەست نیشانی قۆناغەكان بكرێت .
★ لە كۆتایی ئەم سەرنج و پێشنیارانەماندا هیوا خوازین توانیبێتمـان شیعـرەكـانـمـان یەكـالا كردبێتــەوەو مەبەستی پێشەكیەكەمان پێكابێ . ئەم هەوڵەشم تەنها لە خزمەتی ئەدەبی منـدالان دایەو هیچ نیازێكی ترمان نیە بێجگە لە دلسۆزی و ئەمەك نەبێ ، داواكارین كاك « ئیبراهیم ئەحمەد شوان » یش بە نیازیكی پاكی لە قەڵەم بدات.

●

# بێسارانی

دارشتنەوەی :

دوکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوول

«١»

ئاخ بۆ منالی ، ئاخ بۆ منالی
ئاخ و دریغا لە بۆ منالی
گویی دلم لە خەم تەواو بوو خالی
بێ باك لە لۆمەو لە خۆشی و تالی
هەر یاریم ئەکرد من لەگەل یاران
ئەچوومە باوەش ناسك نازداران
بۆم ئاشکرا بوو روومەتی جوانان
ناو زولفی رەشیان بۆم بوو بوە سەیران
ئیستا لە شوومیی زەمانەی باتل
نازداران یەك یەك لیم کەوتوونە سل

«٢»

ئەمشەو جەستەی من ، ئەمشەو جەستەی من
ئەمشەو بیدیایە کەسێ جەستەی من
حالی بەشیویی جەستەی خەستەی من
نائومید ئەبوو لەبۆ جەستەی من
دەروون لە دووری ئەگریا بەتاو
لە چاو ئەتکا یەیایەی خویناو
دەروونم لای عەرش بوود نالە نالی
رووی زەمینیشم بە روو ئەمالی
نە دەمێ راحەت ، نە تاوێ ئارام
تا رۆژی رووناك بەم چەشنە یارام[1]
کەسێ بۆ قیبلەی ئەمە گیانی بێ
بۆ ئەو زۆر کەمە ، گەر سەد گیانی بێ

(١) یارام : رامبوارد

# رۆڵەم چیا ... !

محمد أمین پێنجوێنی

لە کوێ بێنم ؟ موسای گوساغ
بە گۆچانی دەریا شەق کاو
گوزەر بکەی ...!
فیرعەونەکانیش هەڵلوشێ ...
نەهەنگی (موعجیزە) ی وێنس
چۆن پەیدا کەم ؟ قوتت بداو
لەناو سکیا (ذکر بکەی) !
کوا ؟ سلێمان فەرمان بدا
بە ئەرژەنگی بەدێو سپی
بتکاتە قەلاَندۆشکانی ...!
لە ئەستێرەی (کاروانکوژە) ت
حەشاربدا ... !
یاخو عیسای ئاشتی پەروەر
دەستور بدا بە تیشکی خۆر
رۆتکا بەرەو پشتی گارەش
دڵی زەوییت بۆ بکا بە ماڵ ...!
«وەکو هاوریانی ئەشکەوت» [١]
بە ئاگا بێیت پاش سەدان ساڵ ...
فەرهادی کورد چۆن بدۆزم
بە تەشوی پۆلاَی سەوزەوار ...!
جەرگی سەختی بێستون بسمێ و
بۆت کابە تاق ...!
ئەڵێن سیمرخ لە ژێر باڵیا
هێلانە هەن ...!
نایەت بتبا بۆ سەر لوتکەی
ئێڤرست وئەلپ و دەماوەن
لەوێ بتکا بە بەچکەی خۆی ...!
تا ئەژدها پێت نەوێرێ ...!

کوا ؟ (گا گارین) بۆ ناو گێژی
گەردونت با ... بۆ ئەتمۆسفێر ...؟ [٢]
لەسەر زەوی وەدەرت خا...
ببیتە میوانی ناوازە !
لە ئەستێرە یەکدا نەناس ...!
[لە دڵە راوکێ ساتارم کاو
ئوقرە بگرم
ئارام ببێتە جوڵانەم
لەم خورپەی نیگەرا نی‌یە
لەنگەر بگرم .... ! ]

★★★

چیا هەردو گڵینەکەم ....
روناکی سوماو بینابیم ...!
تە سەلای رۆژ ، پێکی شەوم !
ئەندیشەی کاتی تەنییایم ...
چیت لێ بکەم ؟ گەورە ئەبی
ترس لەتەکتا باڵا ئەکا ...!
لەناو دڵما یا ... لە چاوما بت شارمەوە ؟!
نەء نەء نەء نەء
چاوی (بروا) و هەر بمێنێ ...
هیوا گروتە مایە هەر
دڵێ برقێو لە گەردون و هەندەرانا
گیانی پەیام بباتەسەر
بە چەشنی مەهدی‌ی مونتەزەر ...!!

١ ـ هاورێیانی ئەشکەوت = أصحاب الكهف
٢ ـ ئە تمۆسفیر = فەزای خارجی کە دەورەی زەوی داوە

# بن بێدەرا خەمان

ئیسماعیل تاها شاهین

١٩٨٦

بێ خەلك چو هزرێ بو نەكـت ، هزرا مەزن تو بو دانـە چ گاڤـا بەریـێ خوە تەدیـت ، گاڤێ بێ تەكـبیر مەرابـە هەیـە بەرێ بچـووك برا ، سەرێ گەمـبولان بن ئاخ كت كەچـەل وەردێ بتـە حەكیم ، هەكـە كەچـەلیا خود ساخ كت كولكـا تو چارەسـەر نەكـی ، پیـژی مەئـاخـڤـە برا چرایـێ بەس بوخـوە هلبـت ، چوجـا مەبـە ریـزا چرا

دابـینـشـا دەردو كولێن خوە ، بو بێكـولان چوجـا نەكـی پێ دەرگـەهـەك ل تەگـرتـی ، كوفـرە دلێ خوە بو ڤەكـی تە قەدرێ خوە دێ هند هەبت ، هنـدی عەیباتـە بن پەردە دیـلانـا بێبـاب داكـەڤنێ ، هنـدی تە بێ چێ بت بەردە قەودت ئەوە ئەم وی نەكـن ، پێ پەشـیمـانـی ل دووبـت لاویـنـیـا بێ سنـج چیـیـە ؟ نابت لاوینی بەس رووبت رەنگ و رووبار چەند ب شەوق بن ، نەشێن كوران سەردبێن ل بەر هەتـاڤـا روژا رون ، شەمـال بێ رەوشن خوە چ بن هەچیێ ب ساز دێ دەرویش بت ، هەكە دەرویش دەڤ راكن سوژ ب كونـجـان سوژ بن ، دەهبـە خر سوژیـێن چاكن دێ چ بینـن چاڤـێن دزیق ، هەكـە دل ب خوە دخـەوبت كی دێ هزرێ بو وی كتن ، پێ بو سەرێ خوە هەر كەوبت كی دێ گوە دتـە شیرەتێ ، گەر شیرەتكـار گورگـە مێش بت پشتا مەدێ ب كێ راست بت ، هەركەس تێر حوە دلێش بت تشـتـێ توپـێ قایـل نەبـی ، ب سەركـەسێدە لێمـەدە نەهـەر تشـتـێ پارە تێرە ، مروڤ دێ شێـت بێـژت كەدە قوربـان پێ ب كەیفـا تەڤـان چوجـا دل خوەش و شا نەبت چەتـنـە ب كەرب ودلمـانـێ ، دەرگـەهـێ خێرێ لێ ڤەبت پێ دلـانـا تەپێ خوەش بت ، ابەر چاڤان خوە دل خوەش كە ئاگـرێ شەوقـەكـێ بدت ، هنـدی ئەپـێـچـێبت گەش كە تشـتـێ مروڤ هەوجـەبـتـێ ، بقەدرە خوە بلا چ بت چاڤـێ خوە ل تە كورەكـر ، كورەكـر خوە چاڤـێ م بت وژدانـا قەد ژەنـگ نەگـرتـی ، ب مرنـا وێیـە خەلەتـی ل بەخـتـێ وی ئەولە مەبـە ، پێ تو ب دەربـێ وی كەتـی هەتـا ل سەر دەستـان نەچی ، قەدرێ پیـان خویـا نابت پێ ژی خوە ل بەر ناگـرن ، پێ بێ سەرێ خوە هەررابـت ڤان گوتـنـان بكـە گوهـار ، بلا هەر دگـوهـێ تەبـن هەر دەرگـەهـەك و مفتێ خوە ، دەرگـەهـێ بێ مفتـە ناڤـەبن

# چەند کۆپلەیەک لە دیوانێکی ونبووی مایکۆفکی

لەتیف هەڵمەت

### ١ ـ دەنگ

من ئەو بایەم
خۆڵەمێشی سەدەی خەوم
لەچاوی ماندووی شار تەکان
ئەو هەتاوەم بەرمی ماچ
بەستەڵەکی مێژووم شکان

●

گەر من نەبام
ئەم کێوانە وابەرز نەبوون
گەر من نەبام
درەختەکان وا سەوز نەبوون
گەر من نەبام
سەدان ووشە
دەکەوتن لە گەشەو پرشە
نە جوانییان دەما نەتام ...!

●

من پێم وتن : فەرهەنگەکانتان رزیون
هانێ بگرن فەرهەنگێ نوێم بۆ نووسیون

●

چی ئاسنە بیکەن بەتەور
نابڕێتەوە ئائەم باڵا لاوازەی من
منم شیعرو برووسکەو هەور
منم کانی وشەی رۆشن
هەرچی ئەڵێن ... بڵێن ... بڵێن
بخەنە رێ لەدووم سەدان تەوری ژەنگن
یەکەم هەنگاو هی منە من
هەرچی ئەڵێن ... بڵێن ... بڵێن ..
سوارەکانی ئاوارەی دوای شیعری مەزن
ئێوە هەموو بەجێ هەنگاوی مندا دێن ...
هەرچی ئەڵێن ... بڵێن ... بڵێن ...

### ٢- ئەفسانەی دوژمنایەتی

دەگێرنەوە ... سەردەمانی کۆن و پێشوو
شاعیرێکی سەوداسەر بوو
شایەك پێی گوت : ئەیْ شاعیری بەنگیو سەرچڵ
گەر مرواری هۆنراوەیەك بکەی بەئەوکی تاجمدا
زێرو زیوت بۆ رۆدەکەم وەك پووشیو کا
فەرمان دەدەم کچان شیعرت لەمل بکەن لەجێی خشڵ ...!

●

شاعیر بە برسێتی نوست شەو ...
بۆ سبەینێ کە لەگیانی کرایەوە
قەڤ زۆڵانەی کۆتی خەو
لەبەر دەرگای کچە هەژارێکدا وەستا
هەموو زەوی بۆ نوقم کرد لە هەڵبەستا ...

●

من نازانم وەکو باس دەکەن پیرەژن
پاشاو شاعیر لەو رۆژەوە بوون بە دوژمن ...!

### ٣ ـ یەکەم تێبینی

با شاهانشاکان گوێ بگرن
شاعیرێك دەیەوێ بدوێ
با رەشەباکان راوەستن
نێرگزێك دەیەوێ بروێ
با تفەنگەکان بێ دەنگ بن
منالێك دەیەوێ بنوێ

●



# عەشقی ئێمە

فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی

ئەڵێن گوایە
من شاعیرێکی ڕۆمانسیم
تەنیا باسی
خەمی دووری و
گۆشە گیری و
یادی ڕابردووی خۆم ئەکەم
لەشەوانی داگیرسانا
کپ و بێ دەنگ
خامۆش و مەنگ
حەز بەسووتانی مۆم ئەکەم
ئەیانەوێ
ئیتر هەرگیز باست نەکەم
نەک لەشیعرا
لەخەونیشا ناوت نەبەم
نازانن تۆ
پایتەختی وولاتی دڵ بووی
لەچاوانتا هەتا تێر بووم
گەلێ وانەی
عەشق و خۆشەویستی فێر بووم

●●●

عەشقی ئێمە
بۆ کپ بوونی
دوای خرۆشانی لەش نەبوو
بەرواڵەت بەرگ سپی و
لەناخی ناخیا ڕەش نەبوو
عەشقی ئێمە زۆر خاوێن بوو
هی ناو شادەماری خوێن بوو

●●●

هەن .. هەر لەناوت ئەپرسن
بۆ ڕەنگی چاوت ئەپرسن
**هەن ئەڵێن ئێستا لەکوێیە ؟**
**لێرەیە یاخود لەوێیە ؟**
**هەن ئەڵێن ئێستاش هەر جوانە ؟**
**وەکو جارانی جارانە ؟**
**هەن ئەڵێن دەستی زەمانە**
**بۆ کام هەواری بردووە ؟**
**هەتا ئێستاکەش هەر کچە**
**یان دەمێکە شووی کردووە**
**هەن ئەپرسن ئەڵێن ماڵ و حاڵی هەیە؟**
**هەن زۆر لەوە زیاتر ئەڕۆن**
**ئەڵێن چەند منداڵی هەیە ؟**

●●●

# کرێـــــــوە

صلاح محمد

ڕۆژی هەزاران دڵ ئەشکێ
تەنها یەك گوڵیش ئەپشکوێ
بەڵام لەسەر شۆستەی ئەم ڕۆحە تەزیوە
ێنەها خەم پێ ئەگرێ
ەبەر ئەوەی
نیام منالێکی بەد بەختە
ە لە ئامێزما بەنگ ئەبێ
بۆ دواجار
چاوی تەنهاییم لێك ئەنێ

★

ن ناڵێم مەرگ دڕندەیە
شڵێم تەنهایی کاروانە
ێك دابڕ و بێ جێگەیە
ەی چرا دزراوەکەی گیان
خۆزگە شکاندنتم ئەدی
ێش دابڕان

★

تەمەن دەرگایەکە بەبێ ماڵ
کەسێ بەیانی باشی لێ ئەکرد
تا ماڵئاوایی لێ بکا
ئەم ڕێگایە
تەنها دڵی لەگەڵیایە
ئەی ئازیزانی ئەدیوم
چەپکە گوڵێ تەماشامە
خۆشم نازانم کام ڕێبوار
لەسەر کام جێ بە ئەمامە
بۆیە هات و گەڕ چرایە
دوای هەنگاوەکانم کەوتبێ
یەکتر ناسین
تیشکی یەکێ لە ئەستێرەی
شەوانی عەزرەتییمە تیا وون بووبێ

★

من کلیلی ئاوارەییم لای ئێوە بوو
ئێوەش سەفەری سەخت سەخت بوون

ئەمن زانیم بۆ کوێ وە چوون
ئەزانیشتان بۆ کوێ وە چووم
دارستانێکیش نازانێ
گلەیی کەروێشکێکی بریندار
بۆ کێ بەرێ

★

ئەم دەفتەرەم
پڕە لە وێنەی ئەوانەی کە ئەمدیون
هەموو شەوێ ماچیان ئەکەم
خۆزگە ئەو دەفتەرە خەمە
دڵۆپێ تیشکی تیا بوایە
تەنها شەوێك
مۆمێکی پێ هەڵبکەم

★

جاران کچێکم خۆش ئەویست
نێوانمان
تەنها بستێك و
پانتایی دابڕان بوو
ئاسمانێکی پڕ ئەستێرە
بەڵام چاوان نابینا بوو

★

عاشقێ ناگری بۆ لەشێ بۆ ڕاموسان
عاشقێ نابێ بەسوتوو
بۆ بارانی هەموو زستان
ئەی ئازیزان
پەنچەزەیەکی تر واڵا کەن
بۆ بولبولێ
تێر تێر بگری
بۆ ئەو کەسەی
لە «چاوەڕوانی گۆدۆ» ی دا
بوو بە زریان

# راموسانا من کەلـ

- سەعید دیرەشی -

من تو دڤیای ....
هێشتا ژ نوی بهارا مە
بەرەڤ بشکڤینێ دچو
هێشتا ژ نوی ....
روبارێ مەندێ دلێ مە
فێری پێل رژینێ ببو
ژ نوی ئەڤینێ خوە دکێشا
بەر سیناهیا چاڤێن روژێ هێدی
هێدی مەزن دبو

★★★

باشێ ژ نشکا من ددیت
دێمێ تەیێ هندێ شرین
ژێ دباری .... ئاگرو خوین
بهار دبەهی و ....
ژ چاڤێن من ئاڤا دبو
روژ و ئەڤین

★★★

سال و زەمان ....
وەك سویلاڤێن پر هێزو رژد
ژ بانێ عەمرێ مە وەشیان
«دوهی» بەرەڤ بایێ خەما
بوری و چو

دگەل خوە برن هەمی ژڤان
«ئەڤرو» هات .... و
ژ خوەرا زڤراند
ئەڤینەکا گران .... گران

★★★

ئها ئەڤرو ئەڤیندارم
وەختێ ناڤێ تە دئینم
وەکی بستەکا ئاگرێ ....
کەل ، دشارم
وەکی تاڤیەکا بارانێ
لسەر سینگێ تە دبارم
وەکی گورگەکێ دەڤ بخوین
ل گەرمنا چەل و چیا
هەرێ هارم

★★★

ئەڤجا وەرە یارا منێ
هەردو لێڤێن خوە پێن تەنك
بو من ڤەکە .
ئەوی عەڤرێ لسەر بورا تە
بویە دەسمال
ژ هەردو چاڤێن خوە ڤەدە و ....
بژالەکە .

## ...ستره ژ روندکاته

دلێ مژی ....
سیڤەکە دناڤ لەپێن تەدا
تێر بێهنکێ ،
لێ هشیار بە کەرکەر نەکە

★★★

ئەزێ هاتم  نارینا من
ل ژێر چەل و کەڤرێن گارەی
ل ژێر داڤێن وێ هەلزا ....
پرچا وێ وەك دندکێن شەی
هاتم بو تە .... خەلاتەکی بکم دیاری
ئەوژی بەس راموسانەکە
من هەی و نەی

★★★

راموسانا من یا کەلە
ژ گوریا ویژدانا منە
ژگەرما تیژکا روژێ یە
ژ دەریایەکا بێ بنە
باش دزانم .... گەر لێڤێن من
لێڤێن تە بگرن و بمێژن
هەمی بشکوژ دێ گەش بن و
ئەسمان دێ روندکا رێژن



# سوڕەتی شاعیر

بۆتان جەلال

شاعیرێ مرد
لەو ڕۆژەدا .. بەفری لوتکەی شاخاکانیش ،
توایەوە ..!
مۆمی زەرد داگیرساوی ناو شەمعەدانیش ،
کوژایەوە ..!
زریانێکی وا هەڵیکرد ،
هەرچی دار بەڕوو و دار گوێز بوو ،
برایەوە ..!
ماڵت کاول
گەردەلوولێکی وا هەڵسا
شوێن پێی عاشقانی کەناریی دەریاکانیش
سڕایەوە ..!
کەپرو ساباتی ماڵە کوێستانیەکانیش
پوکایەوە ..!
ئا ئەمەیە مەرگی شاعیر
ئەی ئافەرین بۆ سوڕەتی شیعر و شاعیر ..!



سێ پارچە شیعر

● حمه احمد جاف ●

نازاری ۱۹۸۷

## ١ ـ چەك و خامە

لەکونەوە گردی یارە .
قەرارگای دوو هێزی گەورەو ...
خەلوەتگای دوو شۆڕ...
هێزی یەکەم : تۆ... ...ری بابان و ....
شۆرە ... ... پشتی زین
هێزی دووەم ...ی نووسەکەی پیرە مێردو ...
ڕۆژنامە شیرینەکەی ژین .
ئەم دوو هێزە ...
لەکونەوە یەکدی گیرە .
بۆیە دەڵێن
گردی یارە ...
خاوەنی (خامەو شمشێرە)

★★★

## ٢ ـ پرسیار و وەلام

لەپیرە دارێکیان پرسی
ـ ڕاستە ئەڵێن :
ئێستاش لە «تەور» ئەترسی ؟
داریش ووتی
ـ دەمێکە دوژمنی تەورم
ـ ئەی بۆچی لێی دەکەی لۆمە ؟
پیرە داریش توند قیژاندی
ـ ئەی گوایە ئێوە نازانن
کە «تەور» کلکی لە خۆمە !!

★★★

## ٣ ـ گفت و بەڵێن

هۆ دایە گیان .
خۆ وەبیرتە ئێوارەکە
لەسەر سەکۆکەی بەرماڵان .
کە دانیشتی بەرامبەرم ! .
گفتت دامێ ....
ڕانك و چۆغێکم بۆ بچنی
لەهی باوەو ...
بۆ «نەورۆز» بیکەمە بەرم !!؟

★★★

# لێرمەنتوف

○

وەرگێرانا :
بدل رفو مزوری
ژ ئەزمانێ روسی

○

هوزانڤانێ روسی « میخائیل یوریڤیچ لێرمەنتوف » ل موسکو سالا ١٨١٤ ز یێ ژ دایێ بوی ، دهێتە دانان هەڤالەکێ هەڤچەرخ ل گەل پوشکین . ناڤبری ژ مالەکا خانەدان و هەیێ بویە . هوزانێن وی خوشتڤیێن ئازادیێنە ، شورەشڤانی و پتەوکرنا ل سەر ژینێ .

هەر وەسا پێوەندیەکا کور ل ناڤبەرا کوراتی‌یا هەستاناو بلیمەتی‌یێ یاهەی د هوزانێن ویدا . ل سالا (١٨٣٧) ز هاتە هنارتن بو قادا سەربازگەریێ ل قەفقازێ بو شەرێ چیایێ یا چنکی ئەو سزابو ل سەر هوزانا وی « مرنا هوزانڤانەکی » ئەوا هاتی‌یە نڤیسین ل سەر مرنا پوشکین .

نڤیسینێن ناڤبری د پەیڤن بهێزەکا خورت ل سەر دژاتی‌یا ناڤبەرا خەباتا رەوشتڤانێت روسا ژبو سەربەستیێ و خوشتڤیا کارێ بنرخ ناڤبەرا خورستا تەعلا ژیانێ ل روسیا قەیسەری !
هەر وەسا بیرو رایێن وی دیارن ل سەر جیهانێ برێکا بزڤینێ د هوزانێن وی‌یێن سترانکی ب تایبەتی ، ئەڤ هوزانە ئەوا دانایە جهەکێ پێشکەفتی پشتی پوشکین ئێکەر .

گەشاتیا لێرمەنتوف رەنگاو رەنگە ، دژیانا خو یا کورتدا گەلەك کورتە هوزان نڤیسین و هوزانێن رومانایێن درێژ ،هەر وەسا شانوگەریێن هوزانی ، ورومانەك ژێر ناڤێ ..« قەهرەمانەك ژ ڤی چەرخی » .

هوزانڤان هاتە کوشتنێ د هەڤبەریەکا شەریدا دەمێ ژیێ وی [٢٧] سال، ئانکو ل سالا ١٨٤١ ز ئەڤەژی هندك ژ هوزانێن ناڤبرینە .

## چار کورتە هوزان

### ١. د ئەلبومێدا

نە من نەڤێتن چ چاڤدێری
ل سەر بوراندنا ژیانامنا خەمگین
هەر وەسا دا خازێن ئاشکەرا ناکەم
هوسا ئەزێ فێر بویم ژ کەڤنە روژا
بەلێ ، دنڤیسم ب دەستەکێ نە بەردەوام
چنکی گەلەك هزرو بیر ل ڤێرێ هەنە
ژوان سالێت پڕ کول و ژان

ژ کورته ژینامن ....
بەلێ چ نیشان نامینن پشتی من ...

## ٢. بۆچی .... ؟؟

خانما من .... من تودڤیێو
لەوما هەر ئەزێ خەمگینم
هەر وەسا دزانم ژیاناته
ئەوا پر رۆناهی ... گول گولی
گوهـ نادەته گوتنێت بێ هیڤی و ....
گوتنێت گەنی ...
ژ بو هەر رۆژەکا روهن و ...
گاڤەکا ب شادی
ب روندکاو کول و ژانا
دێ تە بەنە سەر رێکێ و ...
دێ تە پالدەن بو ڤەدەرێ
ئەرێ شرین ...
تویا بکەیف و شادی
لەوما ئەزێ ب دەردو کولم .

## ٣. ژ گوتە

لوتکێت چیا
نفستن د تاریا شەڤێدا ،
گەلی بێ دەنگن
پرن ب تاریا نوی ،
چ نینە رێکێ پیسکەت و ....
لوێرێ نینە لەیزینا بەلگا....
بێهنا خو درێژکە بو دەمەکێ کورت
بێهناخو تو ڤەدە .

## ٤. پەردا گەمیێ

بتنێ و سپی د هەژیێن
د تەم و مژا دەریا شین
ل چ دگەریێت ل وەلاتێن دویر ؟؟
چ دهێلیت ل سنورێن وەلاتی ؟؟
xx xx xx
پێل خو لێکددەن ـ با دەنگ ڤەددەنْ
پەردێن گەمیێ دیاردبن و بەرزە دبن
ل پێش چاڤا ...
جێ داخێیە چنکی ل خوشیێ نا گەریێت و ...
هەر وەسا ژوێ نارەڤیت .....

ژێدەر : دیوانا شعرێن روسی و سوڤێتی ـ موسکو ١٩٨٣ پەرێت [65 - 66 - 71 ] .
UcmorHuk
PycckaR u CobemckaR no93uR
Mockba - 1983 -
CmpaHuisa [65 - 66 - 71]

# سەردەم و .. نەرویٚ

محمد رشید فتاح

وا ئیمشەویش کاتی چوونە بە ر دەرگەی دایکم هات . شەوانە ئەمو دایکی نەرویٚ – پێش قاپی یەکەی ئێمە دەگرن‌و ، تا درەنگانیٚ . دوو بە دوو بە گوێی یەکدیدا دەچپێنن و . لە هەزار ئاش دەکەن .. کەسیش نازانیٚ چی‌ی بۆ یەکدی دەهۆننەوە ؟ ! .

کەدایکم تەزبیحە سەدویەك دەنکی یەکەی بە دەستی‌یەوە دەگرێت‌و . بە نێوحەوشەکەدا . لەبەرخۆیەوە دەکەوێتە ورتە ورت . من لە روخساری وشکەڵاتوویدا ئەوە دەخوێنمەوە . کە پێم‌بلێت.. « سەردەم.. سەردەمەکەم.. دەزانم.. چاك دەزانم . زۆڵی حەرامزادە . چاوە چاوی چیتە.. پەلەمەکەو . ددان بە خۆتابگرە . هەر ئێستە یا تاوێکی دی نەرویٚی خروخەپان . لەوبەرەوە دێتەلات‌و . پێکەوە قسان دەکەن .. دەزانم . سەلکە سەگ . لە چاوتا دیارە . دەزانم بۆ ناچیتە دەرەوەو . تێکەلٚ بە کورو کاڵی گەرەك نابی . وا نەزانی من لە گوێی گادا نوستووم . هەر ئێوارە دادیٚ ژێر دار تووەکەم لیٚدەگری‌و . بە کتێب‌و . پەرە قاقەزەوە . خۆت خەریك دەکەیت . جا ئەوەش باشە . بەس نی‌یە ناچێتە دەرەوە . تا تووشی گۆبەندێك بێت ! .. سەردەمە نازدارەکەم . لە هەموو ماڵی دنیادا هەر تۆم هەیت . خۆگەر مەکتەبەکەت نەبوایە حەزم دەکرد ساڵ دوانزەی مانگ لە کونی ژوورەوە بخزایتایە . نەرویٚ – یشی کەسی خۆمانە . خاڵت هەر بۆ تۆی داناوە . هێندەی ئەو لە تۆ رازی‌یە . لەکورەکانی خۆی هێندە رازی نیە . بە هۆی ئەوەوە دەمی خەڵکیان بەستووە . دەوا من دەرۆمە بەر دەرگەو . تۆو نەرویٚ – شی . رازو نیازی دڵە کەیلەکەتان بەبادەن» .

* *

ئیشمەو کە نەرویٚ هات‌و بە تیشکی زەردەخەنە هەمیشەیی‌یەکەی سەر لێوە ئاڵەکانی‌یەوە سەرو دڵمی رۆشن‌کردەوەو . لێمی پرسی‌یەوە «– سەردەم.. ئەوە دیسانەوە سەر قاڵی چیت؟! منیش بە هەمان زەردەخەنەوە روو بە رووی دەبمەوە «– نەرویٚ ئەی نازانی ماوەیەکە بەو گوێ‌یەوە خەریکم ! !» ئەی ئەو چی‌ی دەڵێت؟!. لێم ناپرسیٚ «– کە گوێیە؟؟.» گەر پیٚی بلێم...

«دەوەرە لەگەڵما.. دەستت‌بخەرە نێو دەستمەوەو بیٚسرتە وەرە با پێشانت بدەم» بێگومان ئەو.. بە دوو دڵی‌یەوە ، دەستە ناسکەکەی دەخاتە نێو دەستمەوەو . کوڵمەکانیشی بە ئاشکرا دەکەونە بەر تیشکی زەردەپەرو . زەرد هەڵدەگەرێن . لەتەکیشمەوە هەنگاو دەنیٚ . بیٚ هەست‌و خوست هەنگاو دەنیٚ . ئەو دەمە من ئەوە لە بیردەکەم . وەك شەوانی دی دەستە ناسکۆڵەکەی بگوشم . تا تەزووی خۆشی بە نێو دەمارەکانمدا بێت‌و بچێت‌و . ئارەزووشم بهەژێت‌و . تامەزرۆی ماچێکی گەرەمو گوری بم .

کەدوو بە دوو دەگەینەئاستی دیوارەکە. ئەو بە دەمو زمانێکی ترس لیٚنیشتووەوە . دەپرسیٚ « کوا ؟ !» .

من‌پیٚی دەڵێم «– ئەوەتا .. ئەی نای بینی ؟!» .

ئەویش دەڵیٚ «– نەء». کە زێتر نزیك دەبیتەوە . هەست دەکەم دەلەرزیٚ .

« نەرویٚ.. ئەوە دەترسیت ؟! .» .. ئەو بێدەنگەو . ترس‌و . شەرم . زمانیشی لە گۆ دەخەن .

« – نەرویٚ . لاکەرەوە . بڕوانە دار تووەکە . ببینە گەڵا کانیشی بیٚسرتەن . دیارە ئەوان لە تۆ ئازاترن !» ئەمجا دێتە زمان‌و . بە هێواشی پێم دەڵیٚ « –ئاخر دنیا کپەو . شەماڵێکیش رووی ئەم نێوەی نەگرتۆتەوە منیش پیٚی دەڵێم « گیانەکەم .. خۆ ئێمە کپ نین .. ب ئێمەبینە شەماڵ‌و . هەرچی گەڵای دارە نوستووەکە هەیە . بێ هێنینە هەلەکەسەما ! !» .

سپێتی چاوە رەشەکانی سپێتی ددانە مرواری یەکانی لە ئانو ساتێکدا یەکانگیر دەبن . زوو هەست بەوە دەکەم ئیمانی ی . باڵی گرت و . هەڵفڕی . ئەوەتا لەرزەکە بەریداو . دڵە بچوکۆلەکەشی رەوتە

ئاسایی‌یەکەی خۆی گرتەوە بەر . کە دەگەینە بەردەمی دیوارەکە . ئەو یەکجاری سەرو دڵی دەکرێتەوەو . خۆیم لێ نزیك دەکاتەوەو . دەستەکەی دیشم دەگرێو . پێم دەڵێ «– کوا ؟» . رامانو حەپەسانێکی ناوەخت دەمگرنە خۆیان . لە دڵا لە خۆم دەپرسم «– ئەوە بەراست چی‌ی لێ‌هات ؟!» .. دەستێکم لە نێو دەستی ئەو دەردێنمو . چاوەکانمی پێ هەڵدەگلۆفم . « ئەوە بەراست گوێ زلەکەی بە دیوارەکەوە روابوو . کوێرا غەیب بوو ؟!..» .

نەروێ دەستم دەگرێتەوەو . بەرووما پێدەکەنێت .

دەیەوێ لە و گێژاوە قورتارم کات .. من هیچم بۆ نامێنێتەوە تەنیا ئەوە نەبێ .. شەرمەزاری‌یەکەی خۆم بە ماچێکی ئەو لە بیر بکەم .

* * *

با تا ئەو دێت . من چاو لە دیوارەکە خافڵ نەکەم . هاکا وەکو شەوانی دی کەوتەوە پێش چاوم . ئەو بەفرەت لێکراوە بە لایەوە وایە . دەمان ترسێنێو . بەربەستی عیشقەکەی منو نەروێ – دەکات . ئەو گوێیە دیارە هەستی بەوە کردووە منو ئەو باسی چی‌ی دەکەین . بۆیە هەر تاریکی داهات بەو دیوارەوە قوت دەبێتەوە . ئابی لە بیرو بۆ چوونی ناتەواوی . هەرگیز ناتوانی بمانخاتە نێو قاوغێکی داخراوی هەناسە برەوە . ئەو لەوە بێ ئاگایە کە من بە هیچی نازانم .

چەند رۆژێك لەمەوبەر لە دایکم پرسی :– دایە بەراست دارو دیوار گوێی هەیە ؟! .

ئەو دوای تێروانینێکی گوماناوی وتی :– کورەکەم .. باوو باپیرانت بە خۆرایی وایان نەوتووە!! .

وەرامەکەی ئەو هەر هێندە بوو . بۆیە بێدەنگی‌یەکەی منیشی بێدەنگ کرد .

تۆ بڵێی باوو باپیرانم . چەشنی من گوێیان بە دیواری حەوشەو کۆڵانەکانەوە دیتبێ ؟! . باشە گەر دیتویانە چی‌یان لە ئاستیا کردووە ؟! .. هەروا ملکەچو بەی‌دەست روو بە رووی دۆش دامان . یا لە خوا پاراونەتەوە کە بەڵایەکی ناگەهات گیرۆدەی ئەو گوێیە بکاتو . لە کۆڵیان بکاتەوە . یا دەستیان داوەتە پا چو پێمەرەو . پیرە دیواریشیان لە تەك گوێیەکەدا دارماندووە ! .

خۆنابێ خۆیان خواردبێتەوە . کرنۆشیان برد بێ تا سەریان ناوەتەوە .

ئەم گوێیەی ئێستە کە وا بەم دیوارەی ئێمەوە هەڵواسراوە . دەمخانە بەر دەمی بیرکردنەوەیەکی نوێوە . گەر هەروا ماوەیەکی دی شەوانە دانیشمو . سەرنجەکانم بەو گوێیەوە هەڵواسم .. ئەوڵاهیچ بەهیچ ناکەمو . بێ دەستەڵات دەمێنمەوە . ئەی چۆنە پشت گوێی خەمو . با بۆ خۆی هەر بەو دیوارەوە زەق بچێتەوە . نا .. ئەمەیان نا .. کەواتە من سەردەم نیم .. چۆن بەوە رازی دەبم ئەو ئاغاو .. من مسکێن‌بم . ئەو پاشاو .. من گەدابم .. ئەو خواوەندو . منیش عەبدێکی زەلیل .. ئەی خەڵکی پێم نالێن .. چۆن سەردەمێکی ؟! .

ئەی گەر بە دایکم بڵێم .. ئەو چی‌ی دەکات ؟ .. بێگومان ئەو بەر لەوەی باوەرم پێ‌بکات . دەمکات بە کێوا .. ئەی گەر پاچەکە دەست بەمێو . لە بناغەوە دیوارەکە برمێنم . ئەوا لە دیوارێکی دی‌یەوە گوێیەکە دەروێتەوە ..

جا با لە هەر چوار دیواری حەوشەکەمانەوە سەر دەربکات . ئەو کاتە هەموویان دەرووخێنم .. نا .. ناکرێ . با چارێك بۆ ئەم دیوارەیان بدۆزمەوە . ئەو کاتە بیرێك لەوانی دیش دەکەمەوە .

تۆبڵێ .. ئەم گوێیە . گوێی کابرا فیر نەگولەکەی هاوسێمان نەبێ ؟! . بۆ نابێ . خۆ ئەویش هەر گوێی زلە .

کە ئەوەم بە بیردا هات .. دەستم دایە پەیژەکەو بە دیوارەکەوەم هەڵپەسارد . لەسەرخۆ پێیدا هەڵزنام . کە سەرکەوتمە سەرەوە . سەرم کێشایە نێو حەوشەکەی ئەو دیومانەوە . کابرام بە چاوکرد. رادیۆ ترانسزتەرەکەی بە گوێیەکی‌یەوە نابوو . ئەو منی بە چاو نەکرد . دیسان بە گورجی هاتمە خوارەوەو . پەیژەکەم بردەوە جێگەی خۆی . کە هاتمەوە ژێر دار تووەکە. بیرم لەوە کردەوە . رادیۆکەی بە چ گوێیەکی‌یەوە نابوو ؟! .. یا خود ئەو کاتەی بە سەر دیوارەکەوە بووم . سەرم نەوی‌کردایەو . بمروانیایە ئاخۆ گوێیەکە بە دیوارەکەوەیە .. یا نا !!

دەبا تا نەروێ نەهاتووە . جارێکی دیش پەیژەکە هەڵپەسێرمەوە .. خەریك بوو دەست بدەمەوە پەیژەکە ..نەروێ خۆی بە ژووردا کرد .

* * *

– نەروێ .. ئەوە هاتی .

– سەردەم .. چۆنی .. ئەوە خەریکی چیت ؟! .

– ئەی تۆ چۆنی ؟! .. ئەوە بۆ دواکەوتی ؟! .

– ئیشم هەبوو .

کە نەروێ.. ئەمەی وت. لە سەر بەرەکەی ژێر پیردارەکە لێی دانیشت . گلۆپی هەیوانەکەمان هێندە رووناکی پێ نەدەبەخشین . تا ئێمەش وەکو شتەکانی دی ئاشکرا بکات . بۆیە لە نێوان تاریکیو

یـ کیدا دەمابنەوە .
ۆ گەر شەوێك مانگ رووە خرینەکەی خۆی تەواو دەرخستایە ، ئەوا
یەدرەکە دەبووە چەترێك‌و ، رێگەی بارانە تیشکی لێ دەگرتین .
جـ چ رووناکی‌یەك لە تیشکی روخساری نەروێ رۆشنترە ؟ . کەمرۆ
روێ – دەبینێ دەی شوبهێنێ بە سروشتە شێتەکەی بەهارە شێتەی ئەم
یۆ .

بەلاشیەوە وایە دنیاش هەر لەبەر خاتری نەروێ – دروست بووە .
یە منیش هەر دەبێ لەبەر چاوانی جوانی ئەو .. گوێ‌یەکە لە بنا ببڕم .
بەڵام گرنگ ئەوەیە نەروێ – ش هەست بەو گوێ‌یە بکات‌و ، بە
یوی خۆشی بی‌بینێ .. من بێگومانم گەر هەستی پێکرد ، ئەوا لە تەکیا دێتە
شەوە .

نەروێ .. ئەوە لە چی‌ی دەروانیت ؟ .

ە دیوارەکە .

چی‌ی بە دیوارەکەوە دەبینی ؟! .

نەنێوان .. ترس‌ی‌و راماندا .. وتی :

ها .. خۆ ئەوە گوێ‌یەکەیە ! .

نە دڵا گەشامەوە ، هەرگیز هێندە ئومێدم بە خۆم پەیدا نەکردبوو .

ێستە بروات کرد .

ئ .. بەڵام .

بەڵام چی ؟ دەترسی ! .

نزانم .. خۆ تۆشم لە گەڵدایت .

مەترسەو ، دوو دڵی پیشان مەدە ، هەر دووکمان پێکەوە کارەکە بە ئەنجام
دەگەیەنین .

جاسبەینێ بە دیوارەکەی ماڵی ئێمە شەوە گوێ‌یەك سەر دەردێنێ .

ئەویش دەبرین .. خۆ گەر وانەکەین ، گیانەکەم عیشقەکەی من‌و تۆ
دەرەر دێنێ .

قسەتە .. سەردەم قسەی تۆیە ! .

کەواتە نەروێ – تۆ برۆ لە کونی دەرگەی حەوشەوە لە دایکم‌و ،
یکت بروانەو ، بزانە نیازی لێك دابڕانیان نی‌یە .

کەئەمەم پێ‌وت ، ئەو ێدەنگ راست بووەوەو ، رووەو قاپی‌یەکە
بوو ، منیش دەستم دایە پاچەکەو ، خۆم ئامادەی بە گژاچوونی
وێ‌یەکەی سەر دیوارەکە کرد .

نەروێ زوو بەرەو دوا هاتەوە ، بە رەنگێکی ترس لێ نیشتووەوە :
شانی گرتم .

– سەردەم – دایکت باسی ئەوە بۆ دایکم دەگێڕێتەوە.. ساڵێکیان ،
لاوێکی ئەم گەرەکە چوو بوو گوێی دیوارەکەی ئاشە رووخاو – ببڕێ ،
کە چی گوێ‌یەکە لوولی دابوو ، لەوە بە دواوەش کەس چاوی بەچاوی
نەکەوتەوە .

پێکەنیم بەو قسەیە هات. تەریق بوونەوە یەك نەرۆی‌ی داگرت ، بۆیە
لە حەژمەتا وتی :– سەردەم.. ئەمە قسەی دایکتە ، قسەی من نی‌یە ! .

من زێتر پێکەنیم .

– سەردەم دەترسم .

– نەروێ – گەر بترسی ، ئەوا ئەو گوێ‌یە هەر بەو دیوارەوە دەمێنێتەوە
گرنگ ئەوەیە ئێمە چارێکی ئەو گوێ‌یە بکەین ! ! .

دەستێکیم گرت‌و ، بە دووی خۆمدا بەکێشم کرد .

کەگەیشتینە ئاستی دیوارەکە ، گوێ‌یەکە بێ شەر مانە لێ‌ی دەروانین منیش
دەستی نەروێ – م بەرداو ، هێزو تینم دایە بە رخۆم‌و ، پاچەکەم داوەشاند

– لەوە بەدواوە هێندەم بەر گوێ‌کەوت.. کە نەروێ هاواری کرد .

– دەست خۆش سەردەم.. بە خوا چاکت سمی ! .

* * *

لەو رۆژە بە دواوە پیرە ژنێکی دەم بە دۆعاونزا ، سبەینان زوو روو
دەکاتە ئاسۆی دەم‌کەل‌و ، بە دوو چاوی لێڵەوە ، لە دەرکەوتنی خۆری
توێدا سەردەم بەدی دەکات‌و ، لە بەرخۆیەوە ورتە ورتێتی .

سەردەم تازە خەتی دابوو ، بەینێك بووە قەدو باڵای ، گەندەمووی
ریش‌و سمێڵی ،کەوتبوونە بەر دزەنیگای کچۆڵانی گەرەك ، ئەو لەو تەمەنە
کەمەیدا هەڵس‌و کەوتی کەڵە مێردانە بوو ، چاکێ هەستی بەوە نەدەکرد ؟

گەر مرۆ بەنێو روانینەکانی ئەودا ، قوولێ قوولتر رۆ بچوایە ، چی
دەخوێندەوە ؟ . بێگومان ئەوەی بەدی دەکرد ، کە سەردەم جگە لە
عیشقە پیرۆزەکەی نەروێ ، عاشقی شتێکی دیشە .

بۆ دوو عیشق بە جارێك لە نێو دڵە بچکۆلەکەی ئەودا خۆیان حەشار
دابوو ؟! . ئەی بۆنا ؟ . دەشێ دڵی ئەویش لەو دڵە گەورانە بوو بێ ، کە
بە جارێك دوو عیشق لە خۆیان دەگرن ! .

جەلیل کاکە وەیس

# باران و شاپەڕی خەیاڵ

بە کەسێکی شڵەژاو دەچوو یاخود ترسێکی کتوپڕی بوو کەوا لەو کاتەدا هەناسەی سوارکرد. بەڵام سیمای هیچ ئاستەنگێك لەو شوێنەدا کەلەبەری لێ نەگرتبوو. بۆیە گوتت:

– ئیدی مرۆڤەو دەیان سەرەداری ئاڵۆزاو لەناخی دا بەیەكدا چوون. جاری وا هەیە مرۆیەکت بەدرێژایی تەمەن بۆ یەکاڵا نابێتەوە دیسان ئەمەش پاژێکی بچووکی نهێنی‌یە گەورەکەی گەردوونە. خۆ ئەگەر واش نەبوایە ئەوا سەرانسەری گەردوونەکە دیوەو دەرو ڕووکەش دەبوو.

هێشتا لەباری سەرنج بەولاوە زمانت نەهاتۆتەگۆ. هەروا تەماشای دەکەیت‌و زۆریش نی‌یە خۆت ترنجانۆتە نێو ژاوە ژاوی ئەم چایخانەیە. بەڵام ڕێکەوت بەرانبەر یەکدی دای‌نیشاندن. تۆش خاڵ‌و بۆرت بەم جۆرە خستە سەر ڕێکەوتەکە:

لەڕووکاردا تیغێکی زاخاو دراوە. بەڵام تەماشا هەر دەڵێ‌یت فی‌ی لێ هاتووە خۆ پێش نەختێك ئەوەندە کپ بوو لەمانگە شەوی لادێ‌یەکی ئەم گەرمیانە دەچوو. دەبێ تووشی گێچەڵی بیرو ئەندێشە بووبێت. بەڵام من هەر بۆ خۆم وا دەڵێم! خۆ ناشکرێت دەمی پرسیاری لێ‌داپچڕم. کێ دەڵێ وەڵامیشم دەداتەوە؟ لەوانەیە بە ووشەیەکی مزر بناگوێ‌ی پرسیارەکەم سریش بکات. نەء... ئەمە ناکرێت. بەڵام لەوانەیە هەر ئێستا هەڵبسێ‌و فرکەی لێ‌بکات‌و منیش بەکوڵێ نیگەرانی دەروونەوە جێ‌بهێڵێ! گریمان وا ڕۆیشت چی لەمەسەلەکە دەگۆڕێت! دەم‌ناسێت دەی‌ناسم! منیش یەکجار سەیرم بزانە خۆم لەقەرەی چی دەدەم!؟ بێ ئۆقرەیە بۆ خۆی بێ ئۆقرەیە.

ئەو دەمەی ئەو هاتە ژوورەوە تۆ ماوەیەك بوو لەگەڵ بێ‌دەنگی دا ئامێزان بوویت. ئەوەندەی دەرفەتیشت ببوایە گوێ‌ی خۆت لەمەردمەکەی نێو چایخانەکە کپ دەکردو بۆ چۆڕاوگەی ناوڕەکانی شەقامەکە هەستت زاڵ دەکرد کە لەگەڵ لێزمەی بارانەکەدا شڵپ‌و هوور دەکەوتە سەر شۆستەکان‌و ڕووی شەقامەکەی دەشۆردەوە. تا ئەو دەمەش لەگەڵ کەسێك‌دا سەرەداوی ئاخاوتنێکت با نەدابوو، کە ئەمیش هاتە ژوورەوە دەم‌و دەست دەمی چەترەکەی گردکردەوەو بەرانبەرت دانیشت. تۆش تەنها دەستی بەخێرهاتنت بۆ بەرز کردەوەو ئیدی – بەرەو دەرەوە هەڵت ڕووانی‌و خەریکی تێرامانی خۆت بوویت. بەڵام دوای گاڤۆکەیەك نیگات گواستەوە سەر ئەو. بێ ئەوەی بایەخ بە دەوروبەری خۆی بدات کاغەزێکی فلسکابی خستە سەر مێزەکەو ئانیشکی دادایە سەری. بە توندی نیگات لەکاغەزەکە گیرکرد. جارجاریش دەت‌گواستەوە سەر ڕوخساری کە لەگەڵ خوێندنەوەی دێڕەکان‌دا چارەی لێك دەدا یان بزەیەکی دەهاتێ کەرەسەیەکی نوێت بۆ ڕەخسا. بەڵام تا دەهات دەبوو بە خولیاو بەرینتریش دەبوو. نەت دەزانی چ سەودایەکە وا بەرەو ووشەو دێڕەکانی ئەوکاغەزە پەلکێشت دەکاو لێت بووە بەو مەتەڵە مەزنە. ویستت سەرە داوی باسێکی لەگەڵ‌دا بکەیتەوە سا بەڵکو بگەیتە نێو ووشەو دێڕەکان. بەڵام ئەوەی لەنگەری بەلەسەیی سەوداکەتی گرتبوو ئەم لێکدانەوانە بوو:

– چۆن دەکرێ وا تێ‌هەڵچم! نا.. نا با جارێ ئەو لێ‌بێتەوە ئەوسا هیچ نەبێ دەڵێم: (ڕۆژەکەی زۆر تەم‌و مژەو بارانەکەشی بەخوڕەمە. بەڵام بەوەی باشە دنیا سارد نی‌یە!) دیارە ئەویش پاسووخێکی قسەکەم دەداتەوە. لەوانەیە تەنها بڵێت: (ڕاست دەکەیت) و ئیدی دەرگای گفتوگۆم لەسەر دابخات، بەڵام منیش ئەوەندە ساویلکە نیم چۆن دێڵم ئەو هەلەم لەدەست بچێت! یەکسەر (ڕاست دەکەیت)ەکەی ئەو دەقۆزمەوەو دەست لەجەمسەری باسێك گیردەکەم، دیارە ئەویش لێ دەبڕێ بەشێك لەو نیگەرانی‌یەی ڕوخساری لەسەر کاغەزەکەوە بەرەو زاری ڕادەگوێزێت دیارە ئەمەش ئەرکێکەو وا بەسەر منەوە، گەرەکە بیمە دینەمۆو ماشینی دەروونی ببزوێنم هیچ نەبێ لەکەش‌و ئاوو هەواوە دەست پێ دەکەم.

چەرە دوکەڵی جگەرەکێشان هەناسەی نێو چایخانەکەی سوارکردبوو، بەڵام بەوەی باش بوو پەنجەرەکەی بەرانبەرت درزێکی تێ‌کەوتبوو. دوکەڵەکە لە بنمیچەکەوە گێژی دەخواردو بەرەو درزەکە هەڵپەی خۆ

...بوو. بڕێ خۆت سەرزەنشت کرد بەوەی کەوا دوای خولیایەکی ...وی و بێهوودە خۆت سەرقاڵ کردووە.. هەر بۆ ئەوەی ئەم بیرە ...ڕەتێنی دەستت بردو کتێبە بچکۆلەکەت لە گیرفانت دەرهێنا. ...یەکت لێ هەڵدایەوە نیگات لەگەڵ سەرمەشقی مۆنۆدرامادا ...بوون. چاوێکت بە پەرەگرافی یەکەمدا خشان ئێدی وێکرای ...سووکی هاتەوە یاد چونکە لەوەوبەر جارێکت خوێندبۆوە. ...ی شانۆیی یەکی مۆنۆدرامای پێشکەش بکەیت تاك ڕەوی یانە ...خۆت دەنواند. ئەم بابەتەش تەسەللای نەدایت بۆیە دەمی ...ت نایەوەو بەرەو حەشارگەی گیرفانت بەڕێت خست.

...چاوت تێ بڕییەوە ئەو هێشتا سەری هەڵنەبڕیبوو وەلێ ...هێمن تر دیاربوو. تەنها هەستت بەوە کرد کە لێوەکانی لەگەڵ ...ووشەکاندا دەبزوێن و ناوبەناویش بۆ زەردەخەنەیەکی هێمن ...ئەوەندەی تر لە ئاستی دا هۆشت گردکردەوە. لەناختەوە ...بۆ کردنەوەی دەرکەی گفتوگۆ بەم جۆرە هەڵپلکا:

– ...دوکەڵە پیاو دەتاسێنی وابزانم جەنابتان جگەرە ناکێشن؟ ئەو ...ێکی هەڵبڕی و بە سستی تەماشایەکی کردی و گوتی:

– ...

...خۆت بۆ گورج کردەوەو گوتت:

– ...بارانیش دیاردەیەکی مەزنی ئەم سروشتەیە. خۆزگە ئەم بارانە ...ئەم شەقام و شۆستانە دەشواتەوە ئاوهاش دەروونە ناپاکەکانی ...بەڕێز... مەبەستم مرۆڤە گەندەڵ و ژەنگنەکانە!

...هەمان سستی یەوە نیگایەکی بێ وورشەی ڕەوانە کردی و گوتی:

...دەکەی.. دیاردەیە... کێ مەزنە دووبارە کەوتەوە سەر دۆخی ...ئۆ دابڕا ئێدی ئەم بۆ چوونانەش سەری بزێوی یان لەناخی تۆدا ...

...حەریکی پاکنووس کردنی چیرۆکێك بێت بۆیە وا سەرقاڵەو لەو ...دابڕاوە. دەتۆ چاوت لێیە لەو وایە ئەم شوێنە زیندەوەرێکی ...! هەر وایە.. نوسەران جیهانی تایبەتی خۆیان هەیە نەخوازەڵلا ئەو ...کەوا هزرۆکەیەك میوانیانە! ئەم تەرزە کەسانەش لایەنە ...کەیان کزەو لەگەڵ هەموو کەسێك دا هەڵناکەن. ئێ بۆ وا نەبن ...جەنجاڵە گرێی لە دەروونی کێ نەداوە!؟ ئێ ئەم جۆرە ...هەستیان لەباڵی پەپوولە ناسکترە. ئەوە نی یە ئەمیش هەر ...لێرەیە دەنا گیانی چەشنی پەلەوەرێکی سرك لەشەقەی باڵی ...خۆ ئێستا لەکوێ نیشتۆتەوەو شاپەڕی خستۆتە بەر شنەی چ سروشتێك!؟ کەواتە ئەم هاتنەشی بۆ ئەم شوێنە بێ مەڵامەت نی یە! ئەی چۆن! ئەم کەسانە کلّ لەچاو دەدزن لەبری ئەوەی ڕێکەوت هەڵیان سورێنێ ئەمان خۆیان ڕێکەوت دروست دەکەن. منیش پێویستە ئەم هەلە بقۆزمەوە. بەڵام کارێکی سەخت و دژوارەو وا بە ئاسانی ناتوانم خۆم لەقەرەی بدەم هەر چەندە تەماشای دەکەم دەڵێی کەژێکی سەرکەشەو لوتکەکەی سەرەو ژوور هەڵچووە.. تا ئەمە کارێکی دزێوە با لێی تێك نەدەم و داوە ناسکەکانی خەیاڵەکەی نەپسێنم. ئەندێشەو سۆز چەشنی بەهارە بارانە لەپڕ دای دەکات. نا.. نا. لێی ناشێوێنم. دەبا بۆ خۆی لەدەریای ئەو جیهانە پەمەیی یە مەلەی خەیاڵ بکات.

دووبارە بەرەو شەقامەکە هەڵت ڕووانی. بارانەکە وەك کوندەی سەر بەرەو خوار دای کردبوو. شلّپ و هووڕی ئاوی نا ڤۆرەکان بەگوڕتر دەهاتە گوێت. ساتە وەختێك تێکەڵاوی دیمەنەکە بوویت. وەلێ خولیاکە دیسان ختووکەی دایت و بەگیری هێنایتەوە. چونکە لەوە ترسای لەپڕ هەڵسێت و نیچیرەکەت لە دەست بچێت کە ماوەی پتر لە کاژێرێکە لەپارێزی دای. ئەمجارە پێت لە جەرگی خۆت ناو گوتت:

– بەڕاستی ووڵاتی ئێمە یەکجار سروش بەخشەو. چاوت لێیە ئەم بارانە چ دیمەنێکە! ئەم ساڵ گەرمیان فەرو هاتێتی گەر بەهارەکەشی وابێ ئەوە هەر مەپرسە!

– ڕاست دەکەیت. بارانەکەی چاکە تۆزە ڕووناکی یەك کەوتە سووچی دەروونتەوە. بەڵام بەوەدا بە خۆتدا شکایتەوە کە ئەم ڕستەیەی دواییت لە ڕێکاری ئەودا نەبوو:

– (ئەو چی لەم بابەت گەلە داوە. ئێستا لە جیهانێکی تردایە. باران دەباریّ تا باریّ ئارەزووی خۆیەتی. منیش زۆر پێم لێ هەڵبڕی.).

چاوت تێ بڕییەوە ئەو هەر لە دۆخی خۆیدا بوو. ئەمجارە بەبێ ئاگا زارت هەڵێنا: –

– مامۆستا. دەبێ ببووریت مەبەستم ئەوە بوو کە بڵێم ئاوو هەواکەی شاعیرانەیە چونکە ئێوە کەڵك لە سروشت وەردەگرن.

بە هەمان سستی یەوە سەرێکی بۆ هەڵبڕیت و گوتی:

– برا. دەترسم بە شاعیرو ماعیرم بزانیت، نا.. نا. ئەم کاغەزانە گفتنامەی پرۆژەیەکن و خەریکی لێکدانەوەی سەرمایەو قازانجم!!!

ئێدی تۆش بەرزە پێ هەڵسایت و بەرەو دەرەوە خۆت دایە دەم ڕێژنەی بارانەکەوە.



# دل سێبەرێن دلانن

—سەرفەرازعەلی نەقشبندی—

**– لبەر خودیکیٚ روینشتو کەزیا خو ڤەکر پێلێن پرچیٚ رەنگ هەتاڤ شەکرن . خشیانە سەر ملا . خالا رەش ژ سەر زەندکا ویٚ ڤەشارت .. هێڤکرە دیمیٚ خو ییٚ چاردە سالی ژ ئەنیٚ ڤێدا هات .. چاڤێن ڤال بەلیکەکیٚ مژویلانکا خلمەت کارن . . زێرەڤانیا هەردوو کانیا دکەن باوەشینی ل خەونێن وی دکەن. ! ! لێڤێن خو بـئەزمانی تڤدان .. وەك پەریٚ گولا خوناڤ گرتی تەیسین .. گەهشتە گەردەنا سپیو سینگیٚ کێل دبن کراسیڤە دوو چوبکێن سالێنە سەریٚ هەلدای .**

– سیسن کرنژی . کەیفا ویٚ بـخو هات .. شانازیٚ پەر پێڤە چیٚکرن وەکی هەمی کچێن لڤی ژی بایٚ ویٚ بلند بو هند بو دافریت .

دخودیکیٚرا هێڤکرە هەمی لایێن مەزەلا خو .. هەدارا – هەڤالا ویٚ هێش یا مژویلە لبەر مێزیٚ . جار یا ئەنیا خو دکەتە گریٚو پێنڤیسی دبەر ددانێن خودا دگڤێشیت جار ژی یا هەو دکەتە کاغەزیٚو دەست بـنڤیسینیٚ دکەتو کەزیا خو دتبلێن خو دئالینیت .. وێڤەتر پەرتوكو دەست خەت پێنڤیس ییٚ لسەر مێزیٚ رێز بوین .. جلکێن ویٚ قردێلە کراسیٚ سپیو پەتیکیٚ بوز ییٚ بـسنگی ڤە پێلاڤەکا .. سپیو سم نزم یا ژ رەخ دیواریڤە . ژ بلنداهیا دیواری تا خاریٚ تابلوێن رەنگدارێن هەلاویستین .. چاڤێن خو ڤێدا ئینان . کچکا رەسەن . ستران بێژو تەنبور . دارستنا کەسكو سور . دوماهیٚ تابلویٚ ویٚ کچا زارو یا پێلاڤێن ژنەکا مەزن کرینە پیٚ خو .. گڤشکەك بـهزرێن ویٚ کەفت . بێی بەریٚ خو ژ خودیکیٚ وەرگێریت گوت :

– هەدار ئەز چوانترم ئان ئەو .. ؟

هەداریٚ سەریٚ خو بلند نەکر کرنژی :

– ئەو .. دیٚ وەرە ڤیٚ راهینانا کیمیاییٚ دگەل من شروڤەکە، ئەز نزانم

– پاشی .. پاشی دیٚ نیشا تە دەم . نوکە بەرسڤا من بدە چەوا ئەو .. ؟!

ڤیٚ جاریٚ – هەداریٚ – چاڤێن خو بند کرنو مانە بـدێمیٚ – سیسنیٚ ڤە هەیڤا چاردە شەڤ بو رژیایە دکەڤالیٚ ویٚ خودیکا مەزندا .. تابلویەکی تازەبو لاییٚ مەزەلیٚ ییٚ خەملاندی ..

سیسنیٚ شە هاڤێتە سەر تەقچکیٚ خودیکیٚو رابو ڤە دەستێن خو د ناڤتەنگا خو . رەنگیٚ تبلێن ویٚو پیڤزییٚ کراسیٚ ویٚ دناڤێکدا بەرزەبو گوت :

– دیٚ باش هێڤکە من پاشی بێژە .. ئەز ئان ئەو .. ؟!

– تو یا جوانتری .. بەلیٚ ئەو یا مەزنەو سەیدایەو خاندنا خو یا هەو کریو جوانە ژی ..

ڤێجا چیە .. ما ئەزا بچویکم .. بـخودیٚ ئەز لشوینا سەیداییٚ شەمال بام من هەر ژخو نەدگرت هێڤکەمیٚ .. و .... و ......

تو بو خو وەبێژە .. هەداریٚ – ئەڤە گوتو پێنڤیس داناو پالا خو د کورسیٚ .

ما تە نەدیتیە .. چەندا دێم ترشە هەر نزانیت بـگرنژیت . نزانیت کەنی چ چێدبیت .

ئە .. راستە هەرا تورەیەو دفن بلندە .. کچیٚ من نەگوتە تە . دوهی من ل دەرسا ویٚ پەرتوکا خونە ئینابو ئەز بزدیام . من سەد ئایەت کورسی بـخوڤە خاندن هەما های ژ من نەبیت ..

– وەی بـخودیٚ زانیبا نوکە کەزیا تە نیڤا نهو با .. ڤێجا چەوا ئێکیٚ وەکی (شەمالی) . دیٚ حەژ ئێکا هندە تورە کەت..؟!! نیٚ تو نزانی چاڤێن (شەمالی) چەوا ژ ئاشتیٚ دمشتن. چەوا دکرنژن.. مروڤ دین دکەن..!! (هەدار) ما تو دبێی بـراستا حەژیٚ دکەت؟! بەلکی هەما ئاخفتنە خالکی ژ مێشیٚ کریە گامێش .

نزا دبیت .. لیٚ یا دچیتە مالا وان .. ما دیٚ چیتە چ هەکە ....؟!

(سیسن) بـڤیٚ گوتنا هە ئالوز بو . هەر وەکی جارا ئێکیٚ پێڤە ئالوز بوی-

...گوهـ لـڤان سالوخا دبیت لیٚ دڤیٚت لبەر دلیٚ خو بکەتە وەنەو
...یٚ پیٚڤە هەلاویسیت . بتورەیی‌ڤە گوت :
- ... جیە هەکە چو ویٚریٚ .. ما نە خەلکیٚ جهەکی‌نەو ناسیارن‌و هەردوو
... .

- ... .. ما مە شولە پیٚیە .. وەرە تە بیرا من ئینا دا دەرسا ویٚ خاتوینیٚ ب
... هیٚش سویە هی کودکیٚ تورەیا خو بسەریٚ مە ڤە نە شکاندی .
... تو بهیٚی من یا خاندی .. سیٚ پەریٚن داینە مە ژبەر دیٚ بیٚی
... .

- ... دەرسەکا نەخوشە .. مە هەمی روژا ژی یا هەی ..
... ەخوش نینە .. بەلیٚ‌ویٚ یاکریە قورەدەر . ها گوهیٚ خو بدیٚکا من
... ؟! پەرتوکەکا بچویك هاڤیٚتە بەر (هەداریٚ)و دەڤو دەڤ خو
... سەر جهیٚ خوو ئەنیشکیٚن خو نوهلیکیٚدا برن‌و دەستیٚن خو کرنە
... دانە بەرسەریٚ خو .

- ... .. ئەڤە تە نەڤیٚت‌و تو هوسا دەرسا ویٚ بەری هەمی دەرسا ژبەر
... ..؟!!

- ... کەربادا .. دا ئیٚدی نەشیٚت چ بیٚژتە من .. ئەو بخویا بمهانەیە
... گزندەکیٚ ڤریٚدکەت مال‌و دەیکا من بەمن‌را بەرددەت ..
... لسەر من بسەپینیت ئەز زارومە ..

- ... هەکە زانیبا داچ لتەکەت .. ؟!

- ... وەنەبیٚژە .. ماکی دبیٚت نزانیت لەوا هندە ئەز نەڤیٚم .. ؟! ویٚ
... هند نەخوش بەریٚ خو دامن ئەز دئەردیٚ خودیٚدا چوم .. من
... ژی هەمی زانی .. نەگوت ئافەرم .. ب ناڤ چاڤ شینی‌ڤە گوتی :
... روینە .

- ... .. نە ..ئەو هزریٚن تەنە ، ما دیٚ کیٚ بیٚژتیٚ .. ؟! نیٚ هەکە زانیبا ئەو
... بساناهی نینە بئاڤریا ژ تە ڤەبیت .. تو بخو دزانی چ ئاگرە
!!بیٚهنەکیٚ بڤەگیٚران‌و ژبەرکرنا دەسیٚ ڤە مژویل بون ، پەرتوك

**پیٚڤەداو دانا سەر میٚزیٚ . (سیسنیٚ) دبن لیٚڤیٚن خوڤە دگوت «دل سیەریٚن دلانە پا چما سیەرا ڤی دلی ناگەهتە شەنگەها دلیٚ وی ..؟!» ...نگیٚ خو بلند کرو گوتە (هەداریٚ) :**

**- من یا ل پەرتوکەکیٚ خاندی دبیٚژیت هەما مروڤ ئیٚك ژدل ڤیا دلیٚ وی ...گەهـ ددەت ، کەس نزانیت چەوا ..!!**

هەیهو .. ئاخفتنیٚن پویچ ، ما هەکە وەسا با دا بوچی کەڤینە ڤیٚ ...کومانیٚ ..؟! نهو تو دگەل شەمالی‌و ئەز دگەل کوریٚ مەتاخو بام .

- پا من باوەریا هەی مروڤ حەژ ئیٚکی ناکەت هەکە ئەو ژی هزرا خو دمروڤیدا نەکەت .

- ئەڤە لپەرتوکاو فیلمیٚن سینەمایێ وەسانە .. سیسن خوزی ئەوا تو دبیٚی راست بیت ..

- بخودیٚ ویٚ روژیٚ ئاڤیریا چاڤیٚن وی دلیٚ من پڕ سیناهی‌کی .. هند بو دا سەروسە ژ پەیسکیٚ ڤەرسم .. ئەوی هایژ من هەبو .. تو هەر بیٚژە ..

- دبیت ..!! کچیٚ نیٚ ئەو و(شەمال) هەردوو سەیدانە ، لهزار جهائیٚکو دوو دبین دەراڤیٚ هەی حەژئیٚك بکەن.. تە کەنگی دیتیە..؟! ددەرزا دەرگەهی‌را هەکو دبوریت وەکی سیتافکیٚ، ئان لسەر ریٚکا.. ؟!!

- ما هند بەس نینە های‌ژیٚ هەبیت ..؟! نە .. نە .. های ژیٚ هەیە دلیٚ من دبیٚت .

- هەکە تە بەخت هەبا دابیتە سەیدا لخاندنگەها مە ، دا بو مە هیٚت .. دا هەرو بینی .. نیٚ لگەلەك خاندنگەها سەیدایێن زەلامیٚن هەین .

-نە .. پیرە میٚرا دئینن خاندنگەهیٚن کچا ، خو نە – (شەمالی) .. وەکی سەیدایێ مەیێ زمانیٚ عەرەبیٚ دوو چاڤکا دکەتیٚ‌و بیست جار دکوخیت تا رستەکیٚ دبیٚت . باش بو (شەمال) لدەڤ ...

.. هەما دا مرم ..!!

- خو نەمرینە ، ... بینی چەوا دیٚ دگەل بیت ئەڤە بەختە ..!!

- پا تو یا هەستی گرانی .. چ جار نزانی تشتەکیٚ خوش ژمروڤی‌را بیٚژی ..

- تو یا دینی .. یا رکوی ، سەر رەڤی هەر چاڤیٚن تە ییٚ لتشتیٚن ژ تە مەزنتر..

- بخودیٚ تو یا بیٚ مەژی ، د چ ناگەهی .. هەکە ما تەمیٚری نەدیتیە ئەو باریٚ ددڤیدا حەفت جار هندی ویٚیە .. بەلیٚ برەنجا خو دبەت تادویماهیٚ

-خوزی تو یا هوسا نەبای .. دیٚ تو وەستی ، مخابنی تەیە ..

* * *

هەردوو بیٚ دەنگ بون (سیسنیٚ ستوینیٚن دەستیٚن خو ژبن ئەرزنکا خو راکرن سەریٚ ویٚ وەکی بیٚلایەکا رهیای کەفتە سەر نوهلیکیٚ ، هند گران بو یا ژ ویٚڤە دیٚ نهو حەفت تویخا دئەردی‌دا چیت . !! (هەدار) ژی ببشتا کورسیکیٚ ڤە پەچریە بوو چاڤیٚن خو کرنە ستیٚرك لەبەر کاشخانکا

**هەر ئیٚك ژ وان کەفتە دەریا هزریٚن سنیٚلەیا خو .. لجیهانا خو یا پرشەنگ غەوارە بو :**

**«ئەو جیهانا لاویٚ دلی ژ ئەوری دزیٚت سیاری هەسپیٚن ببەر دبیت‌و**



ئەگەرچی لە زۆر لایەنەوە لە خانەی ئاسایی جیان ، بەلاّم هیچ لەم لایەنانە بەرێکی کت‌و مت دانانرێن بۆ ناسینەوەی یەکسەری شێرپەنجە . زۆرجار لە یەك خانەوە دەست‌پێ‌ئەکەن‌و نەوە پاش‌نەوە ئەخەنەوە . بەلاّم هەندێ جار لە هەمان کات‌دا یان یەك دوای یەك لە چەند خانەیەکەوە سەر هەلّ ئەدەن . خانەکانی ئاسایی لەش تایبەتمەندن ، بەلاّم خانە شێرپەنجەیی‌یەکان بەرەو کا تایبەتمەندی ئەچنەوە ، بەشێواوی نەك بە رێك‌وپێکی ڕیز ئەبن‌و شێوەکەیان زۆر جۆرەو مادەی کرۆماتینی ناوك‌و ناوکۆکەیان زۆرە . شێرپەنجە پێش دەرکەوتنی نیشانەکانی‌و ناسینەوەی تووسی‌یەکی گەشەی ئەکا . گەروا دابنێین کە لەیەك خانەوە سەر هەلّ ئەدات ، ئەوا پێویستی بە (٣٠) جار دابەش بوونە تا ژمارەی خانەکانی ئەگاتە (١) بلوێن ، وقەبارەی بگاتە (اسم) ، لەم پێودانگەوە (٤٥) جار دابەش‌بوون دا مرۆڤەکە بەرگەی شێرپەنجە مشەخۆرەکە ناگرێ‌و ئەمرێ .

**بەرگری زانی : Immunology**

ئەو بۆ چوونە نوێ نی‌یە کە ئەلّێ لەشی مرۆڤ بەرگری گەشەی خانە شێرپەنجەکان ئەکات . زۆر خالّ هەیە ڕۆلّی بەرگری لەش یەکالاّ ئەکاتەوە :

وەکو ئەزانین بەرگری لەش دوولایەنی هەیە ، کە بریتی‌یە لە (دژەتەن Antibody) وخانە بەرگری‌یەکان ، ئەم خانانە ڕۆلّیان لە دژایەتی شێرپەنجەدا هەیە ، بەتایبەتی خانەی (T) کە لە کارەکەیاندا پشت بە گرێکۆلّەگلاند – Thymus ئەبەستن .

هەروەها خالّە جولّێنەکان – lymphokine– و دژەتەنەکان ڕۆلّی خۆیات هەیە لەم بەرگری‌یەدا ، بۆ نمونە خانە جولّێنەکان ، خانەی قەپگر – macrophage دەهەژێنن ، بۆ هەلّلوشین‌و تێك شکاندنی خانە شێرپەنجەیی‌یەکان . هەرچۆن کوێنی‌سیل – B. C. Gهەمان ڕۆلّی خانە جولّێنەکانیان هەیە ، ئەم خانە سپی‌یە قەپگرەکان وەرگریان هەیە بۆ ناسینەوەی – دژەژیان – Antigen ە شێرپەنجەیی‌یەکان . جگەلەمە خانەکانی تری بەرگری (خانەی – ADCCو NKو K ) ڕۆلّی خۆیان هەیە لەم بوارەدا ، بەلاّم یەکالاّکردنەوەی ئەم بۆ چوونانە لێکۆلّینەوەی پتری ئەوێ .

گەر لەش ئەم بەرگری‌یەی هەبێ ، ئەی چۆن شێرپەنجە خانەکان قوتار ئەبن‌و ئەم دەردە سەر هەلّ‌ئەدات ، ئەم خالاّنەی خوارەوە ، ئەم لایەنە یەکالاّ ئەکەنەوە .

١ – دژە ژیانە شێرپەنجەیی‌یەکان هەندێ جار هێندە لاوازن ، ناقۆزرێنەوە تا دژە تەنیان بۆ دروست بکرێت .

٢ – ئەم دژە ژیانانە چۆنی‌یەتی خۆیان ئەگۆرن‌و لە بەرگری قوتار ئەبن .

٣ – بێگومان بەرگری لەش زۆربەی خانەکان لە ناو ئەبات ، بەلاّم ئەو هێندە کەمەی دەرباز ئەبن ، دەبنە هۆی سەرهەلّدانی گەشەکە .

٤ – کە بەرگری لەش دائەبەزێ (وەك لەگەلّ چوونە تەمەنەوە) ، خانە شێرپەنجەیی‌یەکان ، زۆرتر دەربازئەبن‌و سەر هەلّ ئەدەن ... هەروەها ئەوانەی بە کنێتی بەرگری‌یان نی‌یە ، سەدهەزار جار زیاتر لە خەلّکی ئاسایی ئەشێ تووشی شێرپەنجە بن .

٥ – لەش لەگەلّ دژە ژیانە شێرپەنجەیی‌یەکاندا ڕادێت .

٦ – لەوانەیە دژە تەن ، خۆی لە دژە ژیان بئالّێنێ‌و بیشارێتەوەو نەیەلّێ خانەقە پگرەکان لە ناویان بەرن ، یان ئەشێ دژەتەن ، خانە بەرگری‌یەکان سست بکەن بەمەش ئەلّێن – یارمەتی دان –

چەند دیاردەیەك لە هەندێ شێرپەنجە دەرئەکەوێ ، ڕۆلّی ئەم بەرگری‌یە لە دژایەتی شێرپەنجەدا ، ئاشکرا ئەکات :–

١ – لە خۆوە پوکانەوە – Regressionی شێرپەنجەی وەك شێرپەنجەی سەر گورچیلە گلاندو گورچیلەو شانە نەرمو خالّەکان .

یان کە بە نەشتەر گەری شێرپەنجەکە لادەبرێ ، ئەوە گەشە تەشەنە کردووەکەی لەخۆوە ئەپوکێتەوە «بۆ نمونە شێرپەنجەی گورچیلە» .

٢ سەر هەلّدانەوە : Reccurenceهەندێ جار دەیان سالّ پاش لابردنی شێرپەنجەی مەمك ، سەرهەلّ ئەداتەوە .

٣ – گەر دەوروبەری شێرپەنجەکە خانەی بەرگری تیابینرا ، ئەوا دەرەنجامی شێرپەنجەکە «وەك لە شێرپەنجەی گەدەدا ئاشکرایە» باشترەو بە پێچەوانەوە .

٤ – لە کاتی لابردنی شێرپەنجەدا ، خانەی شێرپەنجە لە خوێن و برینەکەدا ئەبیزێ ، بەڵام نە ئەبنە هۆی پەل هاویژتن ، نە تەشەنە کردن .

شێرپەنجە «Malignancy» بەوە لە زیادە گۆشت «Benign tumor» جیا ئەکرێتەوە کە توانای پەلهاویژتن‌و تەشەنەکردنی هەیە . بەڵام زیادە گۆشت شانەی دەوروپشتی ئەپەسێوێ‌و توێکڵێك بۆ خۆی دروست ئەکات .

بەڵام شێرپەنجە یان بە دەوروبەری خۆیدا پەل ئەهاوێ‌و شانەکانی دەوروبەری تێك ئەشکێنێ تا ئەگاتە بۆری خوێن یان بۆری لیمفـو ئەوکاتە لەم بۆری‌یانەوە بە هەموو لەش‌دا تەشەنە ئەکات . هەروەها شێرپەنجە توانای ئەوەی هەیە کە گەیشتە بۆشایی‌یەکانی لەش ، رێچکەی تیا بەستێ‌و پەل بهاوێت .

**نیشانەکان** :–

نیشانەی شێرپەنجە جۆراو جۆرو ناجێگرەو ئەشێ لە هەر نەخۆشی‌یەك بچێ . هەندێ جار گرێ‌یەکی بچوکی بێ‌ژانە ، وەك شێرپەنجەی مەمك‌و تەنیا بە «توێ‌توێ نیگاری Mammography» . کە شێرپەنجە زیاتر پەرەئەسێنێ ئەوا نیشانەی راستەوخۆو نا راستەوخۆی دەرئەکەوێ

دەست نیشانکردنی سەرهەڵدانی شێرپەنجەگرانە ، چونکە ماوەیەکی بێ نیشانەی درێژی هەیە ، لە بەر ئەمەیان شێرپەنجەکە زۆربە بچوکی بە هۆی پشکنینەوە ئەدۆزرێتەوەو پیێ ئەڵێین زوو – Early . یان ئەوا نیشانەی دەرئەکەوێ‌و پیێ ئەڵێین لە دەست دەرچوو – Adranced – ، لەم پێودانگەوە ئەو شێرپەنجەیەی بتوانرێ بنبر cure بکرێ ، کەمە. لەبەر ئەمە زۆر گرنگە کەخەڵکی لەهەندێ نیشانەی زۆر زووی ئاگادار بکرێتەوە ، تا زوو رووبکەنە پزیشك بۆ خۆ پشکنین ، کۆمەڵەی شێرپەنجەی ئەمەریکی حەوت نیشانەی دەست نیشان‌کردووە کە ئەبێ بە گرنگی‌یەوە سەیر بکرێن.

١ – گۆرانی مزمانی کۆئەندامی هەرس‌و میز (گرفتی‌و رەوانی ، میزگیران ، میزو پیسایی خوێنی).
٢ – برینێك ساریژ نەبێت .
٣ – خوێن بەربوون یان دەردراوێکی نائاسایی .
٤ – ئەستور بوون‌یان گرێ‌یەك لە مەمك یان شوێنی تردا.
٥ – گرانی هەرس یان ئازار لەگەڵ قووت داندا.
٦ – گۆرانێکی ئاشکرای قەبارە ، رەنگ ، چونی یەتی خاڵ‌یان بالوکە
٧ – کۆکەی بەردەوام یان دەنگ گری .

**جگە لەمانە با بێینە سەر نیشانەکانی شێرپەنجە بە گشتی** :–

**١ – نیشانەی پەستاوتنی دەوروپشت** :

کە گەشەکە نزیك سەر رووی لەش بێت زوو دەرئەکەوێ «ئەشێ لە شێوەی گرێ ، زیادە گۆشت برینی‌کۆنینە ، خاڵێکی در» دادەرکەوێ .

لە کۆئەندامی هەرس و میزو هەناسەدا ، ئەبێتە هۆی گیرانی بوری‌یەکانی‌و خۆی وەك میزگیران ، گرفتی ، یان گیرانی ریخوڵە ، گیرانی بۆری هەواو فش‌بوونەوەی سی Lung Colapse ، یان زەردوویی ، رشانەوە دەربکەوێ .

یان بەم پەستاوتنە شانەی دەوروبەری لاواز ئەکات وەك ئێسکی لاواز بوو بە شێرپەنجە ، زوو ئەشکێ .

**٢ – نیشانەی پەل هاویشتن** :–

ئەم نیشانانە ئەوە ئەگەیەنن کە نا توانرێ شێرپەنجەکە بن‌بر بکرێت .

گەر پەل بۆ دەمار بهاوێ ، ئەبێتە هۆی ئازار ، میروولەکردن ، سربوون ، گۆتی .

گەر پەلی هاوێژتە دەمارەکانی سمت‌و کلێنجە ، ئازار لە کۆم‌و رێکەدا دروست ئەکات شێرپەنجەی پەنکریاس ئازاری ناو قەدو پشت دروست ئەکات لە شیرپەنجەی سی‌یەکان دەست پەل لاواز ئەبێ وئازاری تێ‌ئەکەوێ .

یان ئەو بەشە بە لەشەوە ئەلکێنێ کە شێرپەنجەکەی تیایە ، وەك نوسانی مەمك‌و نە جوڵانی بە دیواری سنگە .

**٣– نیشانەی مردنی شێرپەنجەکە** :

کاتێ هەندێ شێرپەنجە ئەمرن‌و رووەکەیان هەوئەکاو کاژ فرێ ئەدات ، «وەك شێرپەنجەی گەدەو ریخۆڵە ئەستورەی لای‌راست» ، ئەوا خوێنیاز لێ‌ئەدەڵێ‌و ئەبنە هۆی ماندووبوون‌و کەم خوێنی ، لەوانەیە تەنیا نیشانەی هەندێ شێرپەنجە هەر ئەمەبێ . هەندێ جاریش روخسارە مردووەکەی ئەسوتێتەوەو نیشانەی سوتانەوە بە سەر نیشانەکانی تری‌دا زاڵ ئەبێت ، وەك کاتێك شێرپەنجەی (پانەریخوڵە – Caecum) ئەسوتێتەوە ، نیشانەکانی لە ریخۆڵە کوێرە ئەچێ .

**٤– نیشانەی تەشەنەکردن** :

هەندێ جار بێ ئەوەی گەشەکە هیچ نیشانەیەك بدات ، گەشەتەشەنە کردووە کە زۆر لە دوورەوە نیشانەی لێ دەرئەکەوێ ، وەك گەورەبوون‌و

گریٚ گریٚ بوونی لامل ، یان دەرکەوتنی تەشەنەی شێرپەنجەیەکی شاراوە – Oculte – لە سی‌یەکان ، جگەر ، ئێسك یان دەماغ‌دا .

**٥- نیشانەی سەراپایی شێرپەنجە :**

١- لە رو لاوازی : لەش‌و شێرپەنجەلەمل ملانێدان بۆ خۆراك ووزە ، لە ئەنجام‌دا ، گەشەکە هێزوتین ووزەی لەش‌دا ئەدۆشی‌و مرۆڤەکە لە رولاواز ئەبێ .

٢- دەردانی هۆرمۆن ، لێرەش‌دا شەکرو کالسیۆم –ی خوێن دائەبەزیٚ .

٣- دەردانی مادەی لە هۆرمۆن چوو

٤- فرە هەستیاری نێوان گەشەکە و لەش .

٥- دەردانی مادەی ژەهراوی .

**دەرەنجام :** Prognosis

کەس ناتوانێت بە تەواوی دەرەنجامی هیچ جۆرە شیرپەنجەیەك دیاری بکات . ئەبێ پزیشك راستەوخۆو راستگۆ بێ لەگەلٚ نەخۆشەکەدا ، وای بۆ دەرخات هەموو کاتێك ئامادەیە بۆ یارمەتی‌دانی تا هەست بە ئاسایش بکاو ترسی نەمێنێ .

ئەبێ نەخۆشەکە فێری زۆر شت‌بکریٚ ، تا بتوانیٚ گویٚ بە خۆی بداو هەست بە کەنەفتی نەکاو پاك‌و تەمیزی خۆی بپارێزیٚ ، ئەبیٚ فێر بکریٚ چۆن گویٚ بە گەندەکۆم – colostomyو گەندەگەروو trachiostomy .

ئەبێ یارمەتی ئەو ئافرەتانە بدریٚ کە مەمکیان لە بن‌دا دەبڕیٚ ، تا لەگەلٚ شێوەی شێواویان‌دا رابێن‌و هەست بەشەرم‌و کەمی لەکەك .

هەندیٚ نەخۆش لە ترسی ئەوەی راستی نەخۆشی‌یەکەیان نەزانن حەز ئەکەن پزیشکەکەیان راستیان پیٚ نەلێ‌و لیٚیان بشارێتەوە ، بەڵام ئەبیٚ هەردەم پزیشکەکە راستگۆبێ‌و لە سەر بۆشی دلیٚ نەخۆشەکە نەداتەوە بەڵام بە گشتی ئەبێ نەخۆشەکە هیوابڕاو نەکریٚ ، چونکە نازانریٚ چەند ئەژی ولە داهاتوودا چی روونەدات .

بە گشتی دەرەنجامی شێرپەنجە لە سەر چەند لایەنێك راوەستاوە ، کە بریتین لە

**١- شوێنی سەر هەڵدانی :**

بۆ نمونە (٩٠٪)ی شێرپەنجەی سی‌یەکان ، سورێنچك ، پەنکریاس پەل ئەهاون‌و تەشەنە ئەکەن‌و مرۆڤەکە ئەکوژن .

بەڵام شێرپەنجەی پێست‌و مەمك‌و ملەقۆرتە ، زۆر جار جێگەبین‌و باش چاربکرێن ، سەر هەلٚدانەوە گەر تەشەنەشیان کردبیٚ .



**٢- قۆناغی نەخۆشی‌یەکە :**

گەر قۆناغی یەك یان کەمتر بیٚ (واتە گەشەکە لە سنوری ئەندامەکەدابێ) و پەلی بۆ دەرەوە نەهاویژتبیٚ ، دەرەنجامی چاکترە .... تا بچوکتر بیٚ دەرەنجامی چاکترەو بگرە سەر هەڵنەدەنەوە .

لە قۆناغێکی زیاتردا کە پەلیان هاوێشت‌و بەتەشەنە گەیشتنە گریٚ لیمفی‌یەکان ، ئەوا دەرەنجامیان کەمتر چاکە . گەر زیاتر تەشەنە بکەن وا بە گشتی دەرەنجامیان باش نی‌یە .

**٣- جۆرەکەی :**

**گەر خانەکانی تایبەتمەند بوون ، دەرەنجامی چاکترە .**

**تا بەرەو نا تایبەتمەندی بچن** – Undifferentiated– ئەوا دەرەنجامیان بەدترە .

**٤- بەرگری نەخۆشەکە :**

تا بەرگری‌یەکەی بەرزتربیٚ ، دەرەنجامی چاکترە

**٥- تەمەنی نەخۆشەکە :**

بە هۆ کارێکی گرنگ دائەنریٚ

هەمان شێرپەنجە لە گەنجێك‌دا بەدترە وەك لە پیرێك لە ساوادا ، گەر شێرپەنجەکە پێش تەمەنی یەك سالی سەر هەڵبدات دەرەنجامی لەوە باشترە پاش تەمەنی سالێك سەر هەڵبدات .

لەم کتێبەی خوارەوە کراوە بە کوردی :–

Principles of Surgery by schwartz 4th edition 1987
pageT 313T332.

٥




# لێکدانەوەی ڕەفتاری مرۆڤ و کەسایەتی




بە پێی بۆ چوونی ئەدلێر دەروونزانی تاکە کەس ئەو زانستەیە هەوڵی تێگەیشتنی هەڵس‌و کەوت و ڕەفتاری هەر کەسێك دەدات لەسەر ئەو بنچینەی کە یەکەیەکی ڕێکخراوە . هەروەها بڕوای وایە هەرچی کردەوەمانە ڕێنوومای ئاراستەی سەرەکیمان لە ژیاندا دەکات و مەبەست لەمەش ڕاستکردنەوەی ئاراستە هەڵەو نەگونجاوەکانە لە ڕێگای بەکار هێنانی زانستی بنەڕەتی‌یەوە کە لە ئەزموونگەری تیۆریدا بەکاری دەهێنین [1] .

هەروەها ئەدلێر ژمارەیەك گریمانی تیۆری دەخاتە ڕوو و پێش لەسەر ئەوە دادەگرێت کە تێگەیشتنی کەسایەتی مرۆڤ شتێکی شیاوە ئەگەر بێت وئاگاداری ئامانجەکانی ئەو کەسە بین بە واتایەکی‌تر ئامانجەکانی ( کەسێك ) ڕەفتارو هەڵسوکەوتی دیاری دەکات و ئاراستەشی دەکات ، واتە داهاتوو لە ژێر کاریگەری ئێستادایە ، کەواتە بە پێی بۆ چوونی ئەدلێر جوڵاندن لە پێش بین کردنی داهاتوودا زیاترە لەو شتانەی لە ڕابردوودا هەستیان پێ کراوە .

دیسان ئەدلێر لای‌وایە کە خەڵك مەبەستێکیان لە ژیان هەیەو بە شێوەیەکی دیاری کراویش ئەو مەبەستە تێگەیشت بە پلەی پێگەیشتن و خۆ تەواو کردن . ئەدلێر لە نووسینەکانی سەرەتایدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە مەبەستی سەرەکی ئادەمیزادو هەوڵ و تەقەلای شێوازێکی دوژمنکارانەی هەیە لە پێناوی دەسەڵات کردنە سەر خەڵکی تردا . ئەم گریمانەشی لە شێوەیەکی وەهادا دارشتووە کە ڕووی تێروانینە بۆ مرۆڤ گوایە ئافریدەبوویەکی خۆپەرستەو هەموو مەبەستی مەزنکردنی خودی خۆیەتی .

پاش پێدا چوونەوەو هەڵسەنگاندنی بیرو بۆ چوونەکانی لەسەر ئەوە ڕێك کەووت کە ئامانجی سەرەکی مرۆڤ « بەرزبوونەوەیە » ، هەروەها ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە تێکۆشانی مرۆڤ لە پێناوی (بەرزکردنەوەی خۆدایە) کە دوو شێوازی هەیە :- یەکەم ئارەزووە بۆ سەپاندنی هێز بەسەر کەسانی تردا کە ئەمەش ڕێبازێکی هەڵەیەو تاکە توورەو تەنگە نەفەسەکان دەیگرنە بەر . دووەمیش هەوڵدانە لە پێناوی « بەرزبوونەوەدا » کە بە هەستی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵ پەروەری‌و گیانی هەرەوەزی دەناسرێتەوە بۆ «بەرزبوونەوە و پێگەیشتن» ئەمەش ئەو ڕێبازەیە کە تاکە تەواوو تەندروستەکان دەیگرنە بەر .

### هەست بەکەم و کوری کردن

ئەدلێر لە ڕۆژگاری سەرەتای کارکردنیدا گرنگی بە کەم‌وکوری ئەندامی دەدا واتە بوونی کەم و کوری یان لاوازی بایۆلۆژی کە هەستی بێ‌توانای‌و گۆشەگیری لای مرۆڤ دەوروژێنی .

هەروەها هەوڵی دەدا کە ئەم کەم‌وکوریانە لە ڕێگای بەکارخستنی توانایەکی تایبەتیەوە یان گەشە پێدانی ئەندامانی ترەوە باربوو بکاتەوە .

جگە لەمە ئەدلێر تێگەیشت کە تەنها لاوازی‌و لە کارکەوتنی ئەندامێك نی‌یە کە دەبێتە هۆی لە کارخستنی هەوڵ و ئەرك جێ‌هێنان بەڵکو تێروانینی ئەو کەسەیە بۆ ئەو لاوازی‌و کەم و کوری‌یە . ئەدلێر زاراوەی (attitude - هەڵوێستی) بە شێوەیەك بەکار هێناوە گوایە ئارەزوو یان (نزعە)ی زانراوە بۆ وەڵام دانەوەی شتەکان جێگیرانەو بە ڕێگایەکی پەسەند یان ناپەسەند [2] .

نموونەی باویشی بۆ ئەم مەبەستە (دیموستین)ە کە لە سەردەمی منداڵیدا بەدەستی چەڵەمەی دواندن دەیناڵاند کەچی کاتێ گەورە بوو هەوڵێکی زۆری‌دا تا بووە ووتار بێژی بە ناوبانگی یۆنان . ئەدلێر لەبەر ڕۆشنای ئەم بۆ چوونەیدا وویستی پێ لەسەر ئەوە داگرێت کە ئەو ئەندامانەی لەش کە کەم و کوری‌و لاوازییان تێدایە کار لە نەش و نووماو گەشە کردنی کەسایەتی دەکەن . چونکە هەڵوێستی (تاك) بەرامبەر ئەو کەم و کوریانە هانی دەدات هەتا توانایەکی زۆر بخاتە کار بۆ باربوو کردنەوەیان . (ثیودۆر ڕۆزفلت) کە کەسێکی لاوازو نەخۆش بوو لە سەردەمی منالیدا کە گەورە بوو چاکترین نموونە بوو لە ڕێك و پێکی لەش و لاریدا، هەروەها ئەو کەسەی بە دەم لاوازی بینینەوە ئازار دەچێژێت هەوڵ دەدات هەستی بیستنی گەشە پێبدات [3] . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کەم و کوری ئەندامێکی لەش دەبێتە هاندەرێك بۆ بەرزکردنەوەو ناوو

ـۆزەت بەرز بوونـەوەی ئەو کەسە لە بوارێك لە بوارە جۆراو جۆرەکانی تری ژیاندا، وەك و هونەر، ئەدەب، رامیاری، هتد..

ئەدلێر مەفهـومی هەست بە کەم و کوری کردن وا نیشان ـەدات کە دەرئەنجامی هەستەوەرەکانەو، لاوازیو بێتوانایی هێـزی خۆراگـتن و دان بە خۆدا گرتنـە . هەروەهـا ئەدلێر ـەستەواژەی «نارەزایی نێرایەتی» بە شێوەیەکی وا بەکار هێناوە کە سەرجـەمی باربوو کردنەوە رەفتارییەکان دەگرێتەوە، لەم ـچوونەوە بەپێی بیرو لێکدانەوەی ئەدلێر (بەرزبوونەوە) تەنها ـۆ (نـێریـەتیو پیـاوەتیـە) کە شێـوەی جێگـیر کردنی خودو ـەربەستیو دەسەلات وەردەگرێت، بە پێچەوانەی ئەمەوە کە کەم و کوریو مێیەتی دووزارەوەی بۆ یەکن و بە شێوەیەکی ـمولی رەفتاری مێیەتی نیشان دەدەن کە خراپیو مل کەچیو ـ بەستەیی‌یە .

ـەم بیرو باوەرەی ئەدلێر لەسەر ئەو رۆلانە وەستاوە کە پیاوو ژن ـە کۆمـەڵدا پێی هەڵدەسن ئەدلێر دەستـەواژەی « نارەزایی ـێرانەی » بەکار هێناوە تا ئەوەی پێ نیشان بدات کە ئافرەتان ـە کۆمـەڵدا لە مەکـانەیەکی نزامدان و لە ئەنجامی ئەمەشدا هەوڵ نادەن ( نەخشەی هەستی ناتەواو بکێشن ) لە رێگای ـرەفتار کردنی پیاوانەوە . هەروەها شێوازە رەفتاری تریشی هەیە کە دەشێت لە نێو ئەو ئافرەتانەدا ببینرێت کە رەفتاری ژنانەی ـزیـاد لە سنوور دەکەن ئەو ئافرەتەی کە ( بە مێینەییەکی ) ـزۆرەوە دەردەکـەوێت . وا لێـك دەدرێتـەوە کە مەبەستی لەم شێوازە تەنها وەك وەسیلە بەکار هێنانێکە بۆ سەرگەرم کردنە و تەڵە نانەوە بۆ راوکردنی پیاوان بە مەبەستی خۆ بەرزکردنەوەو دەسەلات دار بوون .

ئەم مەفهومەی ئەدلێر هەمان شێوە بەسەر پیاوانیشدا دەچـەسـپێت ئەو پیـاوانـەی کە هەست بە نەبـوونی هاوسـەنگیو ئاسـایشی دەرونی دەکـەن رێگای رەفتارکردنی نەگـونجاو دەگرنە بەر هەتا بیسەلمێنن کە بەراستی پیاون .

(ڤانموزج دون جوان ) کەسێکە کە دەیەوێت لە رێگای سەرگەرم کردن و ئیغـرا کردنـە دووبـارە بوومکـانیـەوە پیاوەتی خۆی بسەلمێنێت . ئەدلێر رای وایە کە ئەم جۆرە دیاردانە چ گوێرەی پیـاو یان بەگـوێـرەی ژن بەڵگەی کەسایەتیەتی تورەو تەنگە نەفەسە .

لە دوای ئەمە ئەدلێر مەفهومی کەم و کوری و لاوازی ئەندامی زیاتر گشتی و فروان دەکاو دەڵێت ئێمە هەمووومان هەست بە کەم و کوری هەستی سایکـۆلوژیو کۆمـەلایـەتی دەکەین . ئەمـەش هەر لە قونـاغی سەرەتـای ژیـانەوە لە چوارچێوەی خێـزاندا دەست پێ دەکات . باوان و خەڵکی تریش تەنها بە لاشـە لە منـدال گەورەتـرنـین بەڵکـو زیاتر پێگەییوون و لە گوشادی چەڵەمەکانی ژیاندا بە تواناتر و سەر دەرچووترن . ئەمەش وا لە مندال دەکات هەست بە لاوازیو کەم و کوری بکات لە کۆری گەورەکاندا .

## هەوڵدان لە پێناوی بەرز بوونەوەدا

ئەدلێر براوی وایە کە خەبات لە پێناوی بەرزبوونەوەدا لە هەست کردن بە کەم و کۆرییەوە هەڵدەقوڵێت هەر لەبەر ئەوە وای دادەنێت کەهەموو کەسێك هەست بە ناتەواوی دەکات و لە پێناوی پرکردنەوەی ئەم ناتەواویەشدا هەوڵ دەدات هۆیەك بۆ باربووکردنەوەی ئەو هەستی کەم و کوریانە بدۆزێتەوە هەروەها لاشی وایە کە هەوڵ و تەقەلا لە پێناوی بەرز بوونەوەدا یەکێکە لە راستی‌یە بنچینەییەکانی ژیان . لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە ئەدلێر روو بە رووی گەلێك رەخنە بێتەوە چونکە ئەم مەفهومە لە بیرو باوەری ( نیتشە )وە دەهات کە گۆرانێکی کەمی بەسەردا هاتبوو ئەویش ئەوەیە کە مەفهومی هەوڵدان لە پێناوی بەرز بوونەوەدا مانای بەرز بوونەوەی ئیستبدادی نی‌یە یان گەیشتنی تاك بە ناوەندن و دوا پلەنی‌یە بەڵکو باری پاڵنانی یەکسانیو تەریبی شێوەی نەش ونوومای ئەندامیە .

لە راستیدا ئەدلێر هەوڵی دا کە ئەم مەفهومەی جێگیرو چەسپاو بکات بە پاڵپشتی ژمارەیەك مەفهوماتی پێشتری وەك و ( تەواویی ، هەوڵدان بەرەو بەرزتر ، پاڵنان لە نزمەوە بۆ بەرز یان، پاڵیان لە خراپەوە بۆ چاك )[٤]

( دکمـان ) وای نیشـان دەدات کە سەرکەوتن مانای هەوڵداە لە پێنـاوی گەیشتن بە خاڵی ( خۆتـەواوکـردن )دا . ئەمـەش لای ئەدلێر دەکـرێتـە دوو بەشـەوە سەرکـەوتنی (بەرزبوونەوەی ) تاکە کەسی و بەرز بوونەوەی گشتی . بەرز بوونـەوەی تاکـانـە زیـان بەخشـە چونکە هەوڵدانی تاکە بۆ تێرکـردنی داواکـارییـەکـانی و پرکردنەوەی پێویستی‌یەکانی لەسەر حسابی کەسانی‌تر ، بەلام هەوڵدان لە پێناوی گشتدا راسـت و پەسـەنـدە چونکـە لە ئەنجـامی دەستگـیرۆی کەسانی‌ترەوە توانای تاکە کەسیش بەدی دەهێنرێت[٥] .

**ئەندێشە کۆتایی**

ئەدلێر ئەم زاراوەی بە مەبەستی (ئامانجی ئەندێشەیی) بەکار هێناوە کە رابەرایە تی رەفتاری کەسێك دەکات .
ئەم مەفهومەش لە نووسراوەکانی (هانز فانکەری) فەیلەسوفەوە وەرگیراوە (As -if) کە دەڵێت خەڵکی بیرو باوەڕێك ئافریدە دەکەن ، یان دادەهێنن کە رابەرایەتی رەفتاریان دەکات .
ئەدلێر ئەم بیرو باوەرەی وەرگرت و گەیشتە ئەو ئەنجامە بەسوودەی کە شێوەی جۆراو جۆری هەوڵدانی تاکە جیاوازەکان رووداوەکان بێ زانینی ئامانجەکانی ژیانیان .
ئامانجیش ئەوەیە کە رەفتار ئاراستە دەکات و پێویستە بۆ پێش کەوتنی تاکەکان و نەش و نووما کردنیان .
ئەدلێر لەو بڕوایەدایە کە ئەم ئامانجانە خەیاڵین و شتێکی راستەقینە یان ماتریالی نین . بۆ نموونە دەشێت بڕوا بێنێت بەوەی مەبەستت یارمەتی دانی خەڵکی و خۆخستنە ناو ئەو چالاکیانەوەیە کە بەرژەوەندی خەڵکیان تێدایە ، هەروەها دەشێت وا بڕوا بێنێت کە «گارزنوفایت» و مەبەستەکەشت سەلماندنی سەرکەوتنتە بەسەر ئافرەتاندا لە رێگای ئیغراکردنێکی نا ئاشکراو بێ کۆتاییەوە .[٦]
بەپێی تێروانینی ئەدلێر تەسەورکردنی مرۆڤ روو بەرووی ئەو دیاردانەی لە سروشتدا هەیە دەبێتە هۆی دیاری کردنی رەفتارو هەڵس و کەوتکردنی .
بیرو بۆ چوونی «ئەندێشە کۆتایی» ئەو بیرو بۆ چوونەیە کە رابەرایەتی هەڵس و کەوتی مرۆڤ دەکات .
ئەم خاڵەش لە گەوهەردا بە تەواوی جیاوازە لە بۆچوونەکانی فرۆید کە دەڵێت رەفتاری مرۆڤ لەلایەن پاڵنەرێکی بایۆلۆژیەوە دیاری دەکرێت و تاقی کردنەوەو شارەزایی و سەردەر چوونیش دەگەرێتەوە بۆ قوناغی منداڵی . ئەدلێر لە روانینی بەرەو داهاتوودا سروشتی ئامانجی پێش بین کراوی تاکە کەس وا دەبینێت کە شیانی ئەوەی هەیە وەك دالەیەك لە لێکدانەوەی کەسایەتیدا بەکار بهێنرێت .

**بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی**

ئەدلێر بە شێوەیەکی دوور لە گومان و دڵنیاییەوە بڕوای وایە کە ئێمەی مرۆڤ یەك بەوی ترەوە بەندین ، هەر لە یەکەم رۆژی دەست پێ کردنی ژیانەوە .
هەروەها دەبێت دان بەو راستیەدا بنێن کە هەریەکەمان پشت دەبەستێتە ئەوانی تر یان پێویستی بەیارمەتیان هەیە . هەر لەبەر ئەمە ئەدلێر زیاتر پێ لە سەر کاریگەری و کار تێکردنی کۆمەڵایەتی دادەگرێت وەك لە هێزە بایۆلۆژیەکان ئەمەش بۆچوونێکی دژ بەفرۆیدە .
سەرەرای ئەمە ئەدلێر دەڵێت هەستکردنمان و گرنگی پێدانی کۆمەڵایەتیمان شتێکی ئەزەلیەو دەشێت لە رێگای ئاراستەکراوی گونجاو و لەبارەوە راهێنانی پێ بکەین .
هەر لەم بۆ چوونەوە دەڵێت و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەوڵ و تەقەلا لە پێناوی (تەواو کردنی) خەڵکیدا یارمەتیمان دەدات بۆ بەدی هێنانی گەوهەری ئەم مەسەلە .
واتە هاریکاری لەگەڵ کەسانی تردا هەر یەکە لە ئامانج و مەبەستی تاکە کەسی و کۆمەڵ بەدی دەهێنێت .
ئەمەش مانای ئەوەیە کاتێ کە لێکۆڵینەوە لە بارەی بەرزبوونەوە بەرەو بەرژەوەندی کۆمەڵایەتیەوە ئاراستە دەکرێت واقعیی و سوود بەخشی دەبێت .
بەلام کاتێ کە دوورە پەرێزو گۆشەگیر دەوەستێت و نامۆ دەبێت بە بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی ئەوا پەرشو بڵاوو شتێکی لاوازو ناکاریگەر دەردەچێت .
ئەدلێر لە نووسینەکانی دوایدا بە توندی پشتگیری ئەم مەفهومەی دەکات کە پاشتریش لە گەوهەرەکەی دەدوێین .

**شێوازی ژیان و خودی ( تاك ) داهێنەر**

لای ئەدلێر ئەم دوو مەفهومە وابەستەو پێکەوە بەندی یەکترن و شێوازی ژیان نیشان دەدەن ، واتە شێوازی ژیانی کەسێکی دیاری کراو ( کەسایەتیەکی دیارکراو ) کە لە کۆتایی قۆناغی منداڵیدا پێك دێت [٧] ئەمەش ئەو رێگاو رێبازانە دەگرێتەوە کە خەڵکی لە پێناوی گەیشتنە ئامانجەکانیاندا دەیگرنە بەر . ئەکتەرێك دەیەوێت لە خلالی خوێندن و کاری سینەماو شانۆوە بگاتە پلەی پێگەیشتن . زانایەك هەوڵ دەدات لە رێگای خوێندنەوەو دراسەی چڕو پڕو بیرکردنەوەی قوڵ و موناقەشەی بیرو باوەری خەڵکانی ترەوە سەرکەوتن مسۆگەر بکات .
ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە هەر تاکێك ( کەسێك ) شێوازی تایبەتی خۆی هەیە لە ژیاندا . زانا شێوازی خۆی هەیەو وەرزشەوانیش شێوازی خۆی . رەفتاری هەر کەسێکیش بەشێوەیەکی گشتی لەشێوازی ژیانی تایبەتیەوە ، هەڵدەهێنجرێت . ئەدلێر زۆر پێ لەسەر ئەم مەفهومە دادەگرێت و وای دادەنێت کە بنچینەی ئەو سیستەمەیە کە کەسێك

ـەر پای ئەرکەکانی لەسەر بنیات دەنێت و هەڵس و کەوتی پێ ـەکات .

گرنگترین شتێک کە لەمە ئەنجامی دێنێت دیاری کردنی ـەزی تاکە کەسە کە سیفاتی لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی هەیە ـگۆیرەی رەفتاری تاکەکە خۆیو سەردەر چوونی .

ئەدلێر وا بۆی دەچێت کە شێوازی ژیان لە پێنج ساڵی ـەکەمی تەمەنی منداڵیدا پێك دێت و منداڵ لە ئەنجامی هەڵس ـ کەوتی لەگەڵ باوانیدا بە دەستی دەهێنێت و بە شێوەیەکی جێگیرو چەسپاو لە کۆتایی ساڵی پێنجەمدا پێك دێت و گۆرینیشی ـە قۆناغەکانی داهاتووی ژیانیدا شتێکی ستەم و گرانە . ئەم ـێوازە پێکهاتنە کە لە سەردەمی منداڵیدا پێك دێت وەك و جۆرچێـوەیـەکـی لێ دێت بۆ رێ نوومـا کردنی رەفتـاری ـ هـاتـوومـان . واتـە ئێمە لەو بوارەی کاری تێدا دەکەین و ـارەزایی و سەردەرچوونمان تیا بەکاردێنین تەنها ئەو شێوازە ـێکهاتنەی منداڵیە رابەریو رێنومامان دەکات .

ئەدلێر بڕوای وایـە کە شێوازی ژیان وەك و پەرچە کرداریکی هەست بەکـەم و کوری کردن وایـە کە لە ژیانماندا هەستی ـێ دەکەین گەرچی ئەم هەست کردنە راست بێت یان خەیاڵی . ئەو کەسەی هەرچی بەرنامەی ژیانیەتی لەسەر بنچینەی پشت گوێ خستن و گوێ پێ نەدان دادەمـەزرێنێ و رێك دەخات ـیارە بە پێی ئەم بۆ چوونـە جۆرە لێکـدانەوەیەکی تری بۆ ـەکرێت . بەڵام ئەو کەسەی دەسەڵات دارە بەسەر شێوازی ژیـانی و هەستی دوژمنکـارانـەو هێـز بەکـار هێناندا ، وای دەدەنێت ئەو کارەی لەگـەڵ ئارەزوویـدا ناگـونجێت بەرەنگار ـوونەوەیە بۆی .

لای ئەدلێر ( تاکی داهێنەر ) وەك زاراوەو پێناسەکردنی ـریتیـە لەبـوونی توانـا بۆ دروست کردن و بینـاکـردنی کەسـایـەتیو مسـۆگەر کردنی چارەنووس . خودیش دەگاتە ـلندترین پلەو قۆناغی کاتێ کە دروست کەرو داهێنەر بێت ، ـەر ئەمـەش تا سنورێکی دیاری کراو شێوازی ژیان دیاری ـەکات . خودی داهێنەر شتێك نی‌یە کە شایانی تێبینی کردن ـێت وەك بوویـەکی ماتـریاڵی بەڵام لە خلالی هەڵس و کەوتی کەسێکەوە کە رەفتاری پێدەکات بەرامبەر ئەو چەڵەمانەی لە ژیانیدا روو بەرووی دەبێتەوە هەستی پێدەکەین .

مەفهومی خودی داهێنەر ئەوە نیشان دەدات کە ئەدلێر بڕوا بە لێکدانەوەی تیۆری فێرکردن لەسەر بنچینەی « وروژان ـ وەڵام دانەوە » ناکات . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ناتوانرێت هیچ شتێك دەربارەی سەردەرچوون و زانیاری کەسێکی خراپ بزانـرێت . لەکـاتێکـدا کە ئەدلێر وای دەبینێ « کاتی مرۆڤ وابـەستـەی جیهـانی دەرەوەنی‌یە لە سەر ئاستی رێگایەکی پێشتـر دیـاری کراو ، ئەوا هەمیشـە خۆی دەستێتـەوە بە لێکدانەوە دەرونیە تایبەتی‌یەکانی خۆیەوە »[٨]

بەپێی مەفهـومی خودی داهێنـەر هەریـەکـەمـان کەسـایـەتی تایبەتی خۆی ئافریدە دەکات یان دادەهێنێت ، ئەویش لەسەر بنەمای ئەوەی لە رابردووەوە واتە ( باوانەوە ) .. بۆمـان ماوەتـەوە یان لەســەر بنـەمـای شارەزایـیو سەردەرچوونمان .

کەواتە بۆمان دەردەکەوێت کە لە ئەنجامی لێکدانەوەدا خەڵك خۆیان بەرپرسیارن بەرامبەر چارەنووسیان . زۆربەی کاتیش تەنهـا هەر خۆیـان ئاگـاداری شتە بەدەست هێنراوەکانن لە گوشادی چەڵەمەکانیاندا بە شێوەیەکی بەرپرسیارانەو ژیرانە ، بەڵام تاکە تورەو تەنگە نەفەسەکان واتە ئەوانەی کە ئامانج و مەبـەستـەکانیان هەست پێنەکراوەو زۆربەی کات ئاگاداری بەدیـلی بەدەست هاتـوو نین کاتێ روو بە رووی هەڵوێستی دیاری کراو دەبنەوە .

## پرۆسیسی نەش و نوومای کەسایەتی

بەپێی بیرو باوەری ئەدلێر باوان رۆڵی گرنگ دەگێرن لە هاندان و هان نەدانی هۆی گەشەکردنی منداڵەکانیان دا باوان هەوڵ دەدەن زانیاری‌یەکی قوڵ لە بارەی تەنگ و چەڵەمەکانی ژیانەوە بدەنە منداڵەکانیان کە ئەدلێر دەیکاتە سێ پۆلەوە :ـ کە ئەوانیش کارو هاورێیەتیو خۆشەویستین .

ئەدلێر گرنگی‌یەکی تایبەتی دەداتە رۆڵی دایك کە کەسی یەکەمە پەیوەندی توندو نزیکی لەگەڵ منداڵدا هەیە .

ئەگەر دایکێك منداڵەکەی خۆش بووێت شتێکی ئاسایی‌یە کە گرنـگـی بە پەروەردە کردن و شارەزاکـردنـی لە بارەی پێـویستی‌یـەکانی ژیانەوە دەدات بۆ مسۆگەر کردنی خۆشیو بەختەوەری پاشە رۆژی .

دایـك منـداڵەکەی فێری هاورێیەتی و هاریکاری کردەوەی چاك و ئازایـەتی دەکـات . ئەوساش منداڵ هەست بە بوونی

یەکێتی و یەکگرتن دەکات لەگەڵ خەڵکیدا کاتێ سەربەرزانە دەتوانێت ئەرکەکانی ئەنجام بدات و سەربەرزانە کار بکات بۆ زاڵ بوون بەسەر چەمەڵەکانی ژیانیدا . بەڵام ئەگەر دایك گومانی لە رۆڵی خۆی کرد ئەوا ئەوسا سەرقاڵی ئەوە دەبێت کە بوون و بەرزێتی کەسێتی تایبەتی خۆی بسەلمێنێت .

رەنگە هەوڵیش بدات کە بۆ خەڵکی بسەلمێنێ گوایە منداڵەکەی زۆر زیرەك و رەوشت بەرزترە لە کەسانی تر ، ئەنجامی ئەمەش ئەم منداڵە زۆر سست دەبێت لە پێشکەوتنیدا و لە چاو کەسانی تریشدا لاوازو بێتوانا دەردەکەوێت . بۆ بەدبەختیش زۆربەی ئەم منداڵانە بە شێوە پەرچەکردارێك وەڵامی ئەم لاوازیو بێ توانایەیان دەدەنەوە کە بریتییە لە روویەکی بەدخوانە بەرامبەر خەڵکانیتر. هەروەها بەهەمان گیانی دوژمنکاریشەوە مامەڵە لەگەڵ تەنگ و چەڵەمەکانی ژیانی خۆشیاندا دەکەن . ئەم جۆرە منداڵانەش کە هەست و ئارەزووی گرنگی دانی باری کۆمەڵایەتیان نییە بەشێوەیەکی ئاسایی ئەو کەسانەیان لێ دروست دەبێت کە لە کۆمەڵدا پەسەند نین واتە کەسانی توڕەو تەنگە نەفەس و تاوانبارو دەست درێژو بێکەڵك .

ئەدلێر بروای وایە کە گرنگی رۆڵی باوك ئەوەیە بیسەلمێنێ کەسێکی گرنگ و لێهاتووە لە رێگای هاوبەشیکردنیەوە بۆ بەختەوەرکردنی ماڵ و منداڵ و کۆمەڵەکەی . هەروەها دەبێت مێرد وەك و دوو کەسی یەکسان و هاوبەشی هەڵس و کەوت لەگەڵ ژنەکەیدا بکات لە روو بە روو بوونەوەی تەنگ و چەڵەمەکانی ژیاندا . هەروەها پێویستە ژنیش لەسەر هەمان بنچینە هەڵس و کەوت لەگەڵ مێردەکەیدا بکات و نرخی بداتێ . خۆ ئەگەر ژن لە وون کردنی سۆزو خۆشەویستی منداڵەکانی ترساو مێردەکەی ناچار کرد کە لێپرسراوی یەکەمین بێت لە سزادانی منداڵەکانیاندا بەرامبەر کارە هەڵەو ناپەسەندەکانیان ئەوا ئەو ساتە نەوەك و دایك و نەوەك و ژن ئیلتزامی خۆی نیشان نەداوەو بەدەستی نەهێناوە، بەڵکو کارێکی خراپ و بێکەڵك ئەنجام دەدات و تاوانباریشە لەوەی کە رێنوومایی منداڵەکانی تەنها بەمێردەکەی دەسپێرێت، دیارە هەمان بۆچوون بەرامبەر مێردو باویکیش راستە .

ئەدلێر رای وایە کە رێنووما کردنی منداڵ شتێکی خراپەو ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات کە « گرێی هەست بە ناتەواوی کردن » دەشێت دروست ببێت کە ئەمەش بە سێ رێگا پێك دێت لە هەرەتی منداڵیدا ئەوانیش(١) ناتەواوی ئەندامی(٢) پشت گوێ خستن(٣) رێنووما کردن .

## جێگای منداڵ لە خێزاندا

ئەدلێر گرنگی بە مەسەلەی رێکخستنی منداڵ دەدات لە خێزانداو لای وایە کە هەموو منداڵێك لە خێزاندا بە شێوەیەکی تایبەتی رەفتاری لەگەڵ دەکرێت بە پێی ریزبوونی لە دایك بوونی منداڵ لەم رێگا تایبەتیەی رەفتار لەگەڵ کردنیەوە شێوازی ژیانی دروست دەکات کە دواتر دەبێتە بەردی بناغەی رەفتارو هەڵس وکەوتی .

ئەدلێر رای وایە کە منداڵی یەکەم لە خێزاندا یەکەمین جێگای گرنگی پێدانە چونکە « جێگری تەختە » . خۆشەویستی باوانی بە دەست دەهێنێت و هەست بە بەختەوەرییان دەکات لەگەڵ ژیانێکی بەختیارو پڕ ئاسوودەدا . بەڵام کاتێ منداڵی دووەم لەدایك دەبێت بۆ منداڵی یەکەم رووداوێکی جەرگ برە . لەدایك بووی نوێ جێگای مەلیکی کودەتا بەسەرا کراو دەگرێتەوەو گرنگی پێدان و سۆزو خۆشەویستی باوان لە ئەنجامی هاتنی ئەم هاوبەشە نوێیەدا دابەشی دەبێت ... بارێکی ئاوا هەرگیز منداڵی یەکەم دڵخۆش ناکات . بەڵکو بەرەو نەرەزاییو بەرگری کردن دەیجوڵێنێ ئەنجامیش دەبێتە دوژمنایەتی کردنی ئەو منداڵانەی لە خۆی بچوکترن .

بە پێی بۆچوونی ئەدلێر منداڵی یەکەم بە شێوەیەکی چاکتر گرنگی هێزو دەسەڵات تێدەکات مادەم کە بەرگەی وونکردن و لە دەست چوونیانی گرتووە لە پەیوەندی خێزانیدا [٩] . بۆیە بە ئاشکرا دەبینرێت ئەو منداڵانەی کە نۆسکەن زۆربەی کات ئاواتی گەرانەوە بۆ رابردوو دەخوازن و بەرامبەر بە داهاتوو رەشبین و بێ ئومێدن .

لەگەڵ ئەوەشا گونجاو خاوەن ویژدانێکی زیندون و گرنگییەکی تەواویش بە لێکدانەوەی هەر شتێك بە دوورو درێژی دەکەن [١٠] .

منداڵی یەکەم (نۆسکە) بە شێوەیەکی بێپایان هۆگری دەسەڵات نواندن دەبێت و لە ژیانی داهاتووشیدا بروای دەکاتە

سەرو سەرەرای ئەمەش ئارەزووی پاریزگاری کردنی (باری باو) دەکات و حەز دەکات ببێتە رامیاری‌یەکی خۆپارێز . بەلام مندالی دووەم کە نۆسکەی لە سەر تەخت و جێگای بەرزی لابردووە لە بارو هەلویستێکی چاکتردایە چونکە بە تاقی کردنەوەی هەست کردن بە لە دەست چوونی(تەختدا) تێ نە پەریووەو تا ئێستاش جێگای گرنگی پێدان و خۆشەویستی بێ پایانی باوانیەتی . وەك و کاکی ئەو گرنگی‌یەی لە دەست نەداوەو بەلکو لە حالەتی وابەستە بوون و پاشانیش بەرزتر بوونەوەشدا یە لێی . هەروەك گەلێك جار پێش کەوتنی زمان و جولان و چالاکی لەو زیاترە ئەمەش تەماحی منافەسە کردنە بۆ پلەیەکی بالاتر ( هەروەك فرۆید مندالی یەکەمە . لە خێزانداو ئەدلیریش مندالی دووەم )

دیسان ئەدلیر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات ئەگەر مندالی گەورە لە سەر بناغەی یارمەتی و هاریکاری هەلس و کەوت لەگەل برا بچکۆلەکەی بکات ئەوا خۆی واتە برای گەورە بە شێوەیەکی تەندروست و ریك وپێك نەش و نووما دەکات ، بەلام ئەگەر مندالی گەورە (نۆسکە) هەست بە سووك کردنی برا بچوکەکەی بکات ئەوە شتێکی چاوەروان کراوە کەسێکی توورەو تەنگە نەفەس دەردەچێت . بەلام مندالی بچوك لە خێزاندا ئارەزوو دەکات لە شێوەیەکی باشدا گەشەو نەش و نوومای دیاری بکات . ئەدلیر بروای وایە کە باوان حەز بە رێ نوومای مندالی بچوکیان دەکەن و هەولی لاواز کردنی دەدەن و مۆلەتی نادەن بۆ خۆی پەروەردە ببێت . ئەنجامی ئەمەش ئەو مندالە دەبێتە بار بەسەر شانی کەسانی ترەوەو هەمیشە لە چاوەروانی یارمەتی‌و دەستگیرۆیی‌و چاودێریدا دەبێت ، چونکە لە مندالیدا لەسەر بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی‌و گوشاد کردنی چەلەمەکانی خۆی رانەهاتووە . مندالی لەم شێوەشی هەمیشە بەدەست هەستی تال و سوێری کەم‌وکورییەوە دەنالێنێت مادەم خەلکانی تری دەوروبەری لەو شارەزاترو سەردەر چووترن .

بەلام مندالی تاقانە هیچ کەسێکی تر لە خێزاندا نی‌یە منافەسەی بکات و هەردەم جێگای سەربخ و گرنگی پێدانی باوانیەتی کە دایك بوونی رووداوێکی خۆشی هێنەر بووە لە سنوری خێزانەکەدا .

ئەم مندالەش زۆربەی کات پێش قوناغی پێگەیشتنی تەمەنی دەکەوێت و رەفتاری گەورەکان بە خێرایی دەگرێت و هۆی ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ بە سەر بردنی بەشی هەرە زۆری ژیانی لەگەل کەسانی بە تەمەنتردا . زۆربەی کاتیش تاقانە رێ نووما کراو دەبێت و بە تایبەتیش لە لایەن دایکی‌یەوە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی لە رابردوودا روو بە رووی چەلەمەی خۆگونجاندن بێتەوە لەگەل دەوروبەردا .

## نەش و نووما کردنی کەسایەتی

ئەدلێر رای وایە کەسێ بنەمای سەرەکی لە هۆکاری(ژێوار - البیئە ) هەیە کە بریتین لە (١)کەم و کوری ئەندامی ( ناتەواوی ئەندامێکی لەشی) (٢) پشت گوێ خستن و رەت کردنەوە (٣) رێ نووما کردن . ئەدلێر لای وایە کە کەسی تەنگە نەفەس‌و توورە ئەوەیە بە هەستێکی تووندو تیژی خۆ بەکەم زانین دەناسرێتەوە ، کە هەول دەدات بۆ باربوو کردنەوەی ئەم هەست بەکەم و کوری کردنانە لە رێگای دانانی ئامانجی بەرزی خەیالیەوە - کە پێی وایە کاریگەری هەیە لەسەر دەرخستنی ئاستی بەرزتری بەسەر کەسانی تردا : سەرەرای ئەمانەش کەسێکی ووردبین نی‌یە لە هەلسەنگاندنی خۆیداو بەردەوامیش بەهاو پلەی خۆی دا دەبەزێنێت چونکە هەردەم لە دلەراوکێ‌و ترسدایە لە بەرامبەر بریاردان و هەلسەنگاندنداو لە هەلسەنگاندنیش دەترسێ . بە واتایەکی تر کەسێکی ترسنۆکە چونکە کەم و کوری ناتەواوییەکانی ئاشکراو زانراو لای کەسانی تر . کەسێکی لەم جۆرەش هەرگیز ناتوانێت لە خزمەتی کۆمەل و بەرژەوەندیدا کار بکات چونکە لێ هاتوو بە توانا نی‌یە بەلکو لاوازو بەزیوەو ستراتیژی خۆپاراستن بۆ خۆی پێش بین دەکات [11] نموونەش بۆ چەسپاندنی ئەم رایە حالەتێکی گریمانی بۆ قوتابیەك دادەنێین گوایە کە مندالی یەکەمە لە خێزاندا . لەلایەن باوانیەوە گرنگی‌یەکی زۆری پێ دەدرێت و هەمیشە وای نیشان دەدەن لە منالانی خزمانیان لێهاتوو ترو سەردەچوو ترە لە گوشاد کردنی و بە ئاکام گەیاندنی ئەرکەکانیدا ، واشی دادەنێن کە دەبێتە سەرۆك و رابەرێکی مەزن و هەر باوانیشی سەرکەوتنەکانی زۆر بەرز دەکەنەوەو نوچ دان و کەوتن و بێ هیوا بوونی پشت گوێ دەخەن و بۆ هیچ نوچ دانێکیشی سەرزەنشتی ناکەن - بەلکو ئەو

نوچدانەی دەگەڕێننەوە بۆ هۆکاری تر ـ هەروەها نمرەی نزمی لە بابـەتێکـدا بە هۆی کاری ناعـادیـلانـەی مامۆستاو توانا نەشکانی بەسەر ئەو بابەتەدا لێك دەدەنەوە . گەرچی لە کاتی ڕوو بەڕوو بوونـەوەی چەڵەمـەیەکدا هەست بە کەم تواناییو سەردەرنەچوون دەکات ، بەڵام بەوە قەناعەت بە توانای خۆی دێنێت گوایـە باوانی لە نرخـانــدن و هەڵســەنگـانـدنی پڕ موبالەغەیاندا لەسەر هەقن هەر بەم شێوەو لە تەمەنێکی ئاوا منداڵیدا شێوازی هەڵەی ژیانی بنیات دەنێت و دیارە ئامانجە دوورەکانی داهاتووشی پێویستیان بە ووزەیەکی تەواو هەیە تا بەدیان بهێنێت و ئەم ئامانجە خەیالیەی ئێستاشی ڕێگای نادات دان بە هەڵەکـانیـدا بنێت و بڕواش بەخـۆی دێنێت گوایـە کەسـێکی سەرکـەوتـووە بەسـەر کەسـانی تردا و هیـوای بەدیهێنـانی سەرکـەوتنیشی هەیە لەهەر چالاکیەکدا کەپێی هەڵدە ستێت .

## نەش و نووماکردنی کەسایەتی و شێوازی ژیان

بەپێی بیرو باوەڕی ئەدلێر چوار شێوەیان شوازی بنچینەیی هەیـە کە مرۆڤ لە هەڵس و کەوت کردنیـدا لەگـەڵ تەنـگ و چەڵەمـەکـانی ژیـانـدا بینـایـان دەکات . بەڵام کۆنترو لای باپیرانمان بەسێ شێوازی بنچینەیی خراونەتە ڕوو کە بریتین لە کارو هاوڕێیەتی و خۆشەویستی .

شێوازی یەکەم ئەو شێوازە ڕاست و گونجاوەی ژیانە کە ئەدلێر پێی وایـە لە ئەنجامی پەسەندیو ڕێك و پێکی ژیانی خێـزانیـەوە دروست دەبێت واتـە ئەو خێـزانەی منداڵی تێدا پەروەردە دەبێت و بە ڕێزو نرخ پێ دانەوە ڕەفتار لەگەڵ (باوکی) دەکات . ئەدلێر بڕوای وایە کە لەژێر سایەی ئەم بارو زروفەدا مرۆڤ ڕادێت چونکە گرنگی هاریکاریو یەکسانی نێوان خەڵك تێدەگـات و ئەو ڕێبـازە دەگرێتە بەر کە بەرەو بەدی هێنانی ئامانجی دیاری کراوو بەرژەوەندی کۆمەڵایەتیە ، هەر چەندە ئەدلێر سروشتی ئەو ئامانجانەی دیاری نەکردووە . کە دەشێت « سیـاسەتێکی ئایدیالی » بێت لە جوڵانەوەی بەرەو ئامانجی پیشەیی دیاری کراودا بۆ نموونە وەك و پزیشکی ،.زەرەنگەری ، میکـانیکی فرۆشیاری ئوتومۆبیلی کۆن ـ چاك کاری ئامێری تەلەفیزۆن ... هتد . دیسان ئەدلێر بڕوای وایە کە مرۆڤی تەواوو بێ کەم و کوڕی دەشێت ئامانجە خەیالیەکانی بگۆڕێت ئەگەر زرووف داوای ئەوەی لێبکات ، بۆ نموونە ئایا شتێکی پەسەندە کە ڕەفتـارێکی نابەجێ بکات وەکو دزینی نانێك بۆ تێرکردنی منداڵێکی برسی ؟ ئەدلێر بێ چەندو چوون وەڵامی ئەم پرسیارە بە بەڵێ دەداتەوە ، بەڵام دیارە ئەمە تەنها لە حاڵەتی نەبوونی هیچ جۆرە چارەسەر کردنێکی تر دەبێت .

کەسی تەواو ئەو کەسـەیـە کە بەرنامەی ژیانی لەسەر بنچینەی بیرو باوەڕێکی دیاری کراو دادەنێت و هەڵسوکەوتی ڕاست و ڕەوانەو ، لە حاڵەتی ڕوو بە ڕوو بوونەوەی زروفێکی تایبەتیشدا توانای گۆڕانکاری لەو بنەمایانەدا هەیە کەلەسەری دەڕوات .

بەڵام سێ شێـوازەکەی تری ژیان ـ یەکەمیان نواندنی دەســەڵات و فەرمـان کردنـە . خاوەنی ئەم جۆرە ڕێبـازە بە شێوەیەك ڕەفتار دەکات کە هیچ نرخ و بەهایەك بۆ کەسانی تر دانانێت وکەسێکی دڵ و دەروون ڕەق و بەدو ئازار دەرە . جۆری دووەمیش ئەوەیە کە زۆربەی خەڵکی لەسەری دەڕۆن و ئەدلێر بە باوترین شێوازی دادەنێت . بەڵام دوا جۆریش شێوازێکی گۆشە گیرانەو کەنار کەوتنە کە ئەو کەسانەی لەسەر ئەم ڕێبازەن بە هیچ جۆرێك نابزوێن و هەوڵ و تەقەلایان نییە بۆ بەرەنگار بوونەوەی تەنگ و چەڵەمەکانی ژیان .

شلتـەز وای نیشـان دەدات کەئەم سێ جۆرەی دوایی ئامادەی ڕوو بە ڕوو بوونەوەی چەڵەمەکانی ژیانی ڕۆژانەیان نییـەو ئارەزووی هاریکـاری کەسانی تر ناکەن و . کارلێکی نێوان ژیانیان و واقیعی دەوروبەر شتێکی ناوازەی لێ ئەنجام دێت ، هەروەك سەرهەڵدان و دەرکەوتنی تورەییو تەنگە نەفەسی ئەنجامی ئەوەیە .

## شێوازەکانی دراسەکردنی کەسایەتی

ئەدلێر هەر هەمان شێوەی فرۆید هەوڵی دا کە کەسایەتی(تاك ) لەسـەر بنچینـەی بڕواکـردنـە سەرپشکنـین و شیکردنەوەی

شارەزایی و ( خیبرەی) مندالێتی‌یەوە تێ بگات ، لەم هەوڵدانەشیدا سێ شێوەی بەکار هێنا بۆ گەیشتن بەم ( خیبرە) کاریگەرە شێوەی یەکەم پرسیار کردن لەو کەسە بە بیرخستنەوەی شارەزاییە سەرەتاییەکانی‌و پاشان بەراورد کردنی بەو راستیانەی کە تاکە کەسی لە خلالی شارەزایی‌و ژیانی ئێستاوەی دەیخاتە روو کە ئەمەش یەکگرتنی بیرو مەبەستی هاوبەشی ئەو کەسە دیاری دەکات لە رابەرایەتی کردنی هەڵس و کەوت و رەفتاری دا .

شێوەی دووەم بروا کردنە لەسەر لێکدانەوەی خەون وەك رێگایەك بۆ تێگەیشتنی کەسایەتی بەلام بە پێچەوانەی فرۆیدەوە بروا ناکاتە سەر لێکدانەوەی سێکسی لەم بوارەدا . بەڵکو بروای وایە کە خەون بەپێی هیواو ئامانجی سەرکەوتن بەدەست هێنانەوە دیاری دەکرێت .

لای ئەدلێر خەون هەوڵ و تەقەلای نەستی کەسێك پێچەوانە دەکاتەوە بۆ گەیشتنە بە ئامانجە تایبەتیەکانی بەپێی شێوازی ژیانی تایبەتی خۆی ، بۆ نموونە ئەو قوتابیەی شێلگیرەو لە تاقی کردنەوە ناترسێت خەون بە هەڵزنانێکی سەرکەوتوانەوە دەبینێت لە لاپاڵی چیایەکدا بەرەو لوتکە کە گەیشتنە ئەو لوتکەیە مایەی دڵخۆشی و بەختیاری‌یەتی . بەلام ئەو قوتابی‌یەی هەڵهاتووەو ئارەزووی پاش خستنی تاقی کردنەوەکانی دەکات خەون بەوەوە دەبینێت کە لە نزۆپی لوتکەکەوە بەردەبێتەوە خوارەوە[١٢] . بەم شێوە بریاری شێوەی خەونی کەسێك دەدرێت و دیاری دەکرێت بەپێی چۆنێتی ژیانی تایبەتی ئەو کەسە . مەبەست لە لێکۆڵینەوەی کەسێتی یەکێك ئاشکراکردنی شێوازی ژیانیەتی بۆ دیاری‌کردن و بریاردانی ئەو شێوازە ئاخۆ گونجاوو لەبارە یان نا . بەلام شێوازی سێیەم کە ئەدلێر لە دراسەکردنی کەسایەتیدا بەکاری هێناوە بریتی‌یە لە ریز بوونی مندالْ لە خێزاندا (سەرەی لەدایك بوون) بە پشت بەستن بەو لێکدانەوانەی پێشتر ئاماژەمان بۆ کردن و لەرێگای زانیاری کۆکراوەوە لەبارەی ئەم سێ شێوازەوە دراسە کردنی کەسایەتی بە ئەنجام ،دەگات . هەروەها دەستگیرۆیی خەڵکی بۆ راستکردنەوەی شێوازی هەڵەی ژیانیان بە ئاکام دەگات .

## مرۆڤ لە تێروانینی ئەدلێردا

ئەدلێر لە زۆر لایەنی لێکدانەوەی سروشتی مرۆڤدا دژی فرۆید رادەوەستێت ، ( تێروانینی لە فرۆید مرۆڤانە ترە ) و گرنگی‌یەکی زۆرتر دەداتە کارلێکی کۆمەلایەتی و جێگای بەرزو بڵندیو کاریگەری لەسەر داهێنانی مرۆڤ و هەست کردنی بە بەهای مرۆڤ و کاریگەری لەسەر پێکهێنانی خودی داهێنەر بۆ بەرەنگار بوونەوەی باری ناهەمواری ژیان . ئەدلێر لەبیرو بۆ چونیدا گەش بینەو گرنگی‌یەکی تەواو بە مرۆڤ دەدات کە سەرمایەی داهاتووە ... لەبەر ئەوەش کە داهاتوو (ئێستا) هاتووە شایانی گۆرانکاری‌یەکی چاوەروان کراوە ، بە پێچەوانەی فرۆیدەوە کە لای وایە کەسایەتی هەر لە قوناغی مندالیدا پێك دێت و تەواو دەبێت . بە پالپشتی ئەم بۆچوونە کاریگەری گۆرانەکانی داهاتوو لەسەر رووداوەکانی رابردوو (ئیلغا) دەکاتەوە .

سەرەرای ئەوەش ئەدلێر پاڵنەرە سێکسیەکان بە دەسەلاتدارو بزوێنەری رەفتارمان دانانێت و لای وانی‌یە کە رەفتارمان وابەستەی هێزێکی نادیارەو توانای دەسەلات بە سەرکردنیمان نی‌یە .

کە فرۆید بە پێچەوانەی ئەمەوە زۆر پێ لەسەر ئەو پاڵنەرە دادەگرێت . سەرەرای ئەمانە ئەدلێر لای وایە کە مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە بەرێگای تایبەتی خۆی شێوازی گونجاو لەباری ژیانی بگرێتە بەر ئەگەر هات و ئەو توانایەی پێویستە بۆ گۆرینی کەسایەتی خۆی‌و کۆمەڵگاکەی لە ئارادا بوو .

بە کورتی تێروانینی ئەدلێر بۆ سروشتی ئادەمیزاد چاکترین زانست و مەبدەئی ئەخلاقی نیشان دەدات کە ئەمەش بەهیچ شێوەیەك پەیوەست و پا بەندی بیرو باوەری فرۆید نی‌یە چونکە ئاگاداری سێکسی پشت گوێ خستووەو بە چاوێکی رەخنەگرانەی توندو تیژەوە بۆی دەروانێت .

## تیۆری ئەدلێر لەبەر رۆشنایی رەخنەدا

تیۆری ئەدلێر گەلێك دیاردە بە خۆی دەگرێت کە لەم بوارەشدا بەتەواوی پێچەوانەی تیۆری فرۆیدە . ئەدلێر هۆو چارەسەری جۆراو جۆری نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەکان باس دەکات .

لە چارەسەر کردنیشدا پێ لەسەر پێدا چوونەوەی بیرورا هەلەکانی تاکەوە لەبارەی خۆی‌و خەڵکی تریشەوە دادەگرێت و داوای سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی دەکاتەوە . وە بە قوتار بوون لە ئامانجی هەڵەو ناپەسەندو پروا کردنە سەر ئامانجی نوێ و گونجاو هانی خەڵك دەدات بۆ زانینی‌و ناسینی توانایان وەك و «مرۆڤ» هەروەها هەوڵ دەدات تیۆرەکەی بۆ تێگەیشتنی ئەو

مەبەستانە بخاتە روو تەطبیقی بکات کە گوایە دامەزراوە رامیاری و پەروەردەیی و ئاینیەکان کاردەکەنە سەر نەش و نووماکردنی کەسایەتی چ لایەنی پۆزەتیف بێت یان نێگەتیف . هەروەها دەشێت بڵێین کە تیۆری ئەدلێر لە سروشتی پێکهاتنیا گشت گرترە لە چاو تیۆری فرۆیددا کە لەسەر تاکە پاڵنەرێك و تاکە بنەمایەك پێك دێت کە ئەویش سێکسە . لەگەڵ ئەوەشدا کە تیۆری ئەدلێر لە تیۆری فرۆید پێشکەوتووەترە بەلام ئێستا بە دەست هەندێ مەفهومی زانستی تەسکەوە دەناڵێنن کە تەم و مژی گومان دەوری داون .

ئەدلێر هەوڵ دەدات کە هەتەمیەت رەت بکاتەوە بەوەی کە مەفهومی خودی داهێنەر دروست دەکات . هەروەها ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات کە هەر یەکەمان شێوازی تایبەتی ژیانی خۆی بنیات دەنێت ئەمەش پێش ساڵی پێنجەم روو دەدات .

بەلام روونی نەکردۆتەوە کە چۆن منداڵ توانای بەدی هێنانی ئەم بینا کردنەی هەیە .

وە گرنگترین رەخنەش کە یەخەی ئەدلێر دەگرێتەوە پابەند کردنی رەفتارو هەڵس و کەوتی مرۆڤە بۆ تاکە پاڵنەرێك کە ئەویش تێ کۆشانە لە پێناوی «بەرز بوونەوەدا» .

کە لە راستیدا ئەمەش هۆیەکی تەسك تری هەیە کە بریتیە لە هەست کردن بەکەم و کوری .

لە ئەنجامی ئەمەشدا زۆر گۆرانکاری و پێکەوەبەستنی بەهێزو پتەو پشت گوێ دەخات کە کاریگەری گەورەیان لەسەر پێکهاتنی کەسایەتی و رەفتار هەیە .

پاشان ئایا هەست کردن بە کەم و کوری تاکە چەڵەمەیە کە مرۆڤ لە ژیانیدا دووچاری دەبێت و دژی دەجەنگێت ؟ وە ئایا شتێکی مەرجیە یان هەتەمی کە مرۆڤ هەستێت بە هەوڵ و تەقەلا بۆ باربووکردنەوەی ئەو کەم و کوریانە کە ئەم هەوڵدانەش شێوەی تێکۆشان لە پێناوی بەرز بوونەوەو خۆ تەواو کردندا وەردەگرێت ؟ سەرەرای ئەم کەم و کوریانەش تیۆرەکەی ئەدلێر مەزنەو گرنگی یەکەشی ئەوەیە کە ژمارەیەك لە توێژەوەران لە دراسە کردنی کەسایەتیدا بەراستی ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە بە ئەدلێر سەرسام بوون .

ئەدلێر بە یەکێك لەدامەزرێنەرەکانی بزوتنەوەی (مرۆڤایەتی ـ الوجودیە) دەرونزانیدا دادەنرێت لەبەر ئەوەی پێ لەسەر سەربەستی تاك دادەگرێت لە بینا کردنی هەڵبژاردنەکانی و مامەڵە کردنی راهێنەرانەیدا .

ئەدلێر راستەو خۆ یان ناراستەو خۆ کاری لە ژمارەیەك زانایانی ناسراوی دەرون کردووە وەکو کارل رۆجرز ، ئەبراهام ، ماسلۆ ، رۆلوجی ،فکتۆر ، فرانکل ، ئیرك فرۆم ، کارین هورنای ، هاری ستاك سوڵیڤان .

پەراوێزەکان


1- Ryckman , P 86 , 1978

2- Ryckman , P 2 , 1978

3- Pervin , PP 84 - 86 , 1980

٤ـ شلتز ، ل ٧٣ ، ١٩٨٣

5- Ryckman , P 103 , 1978

6- Adlev , 1973

7- Ryckman , P 103 , 1978

٨ـ شلتز ، ل ١٩٨٣

9- Ryckman , P 91 , 1978

١٠ـ شلتز ، ل ٨٢ ، ١٩٨٣

11- Ryckman , P 93 , 1978

12- Adlev , P 70 , 1969


## ژیانی ئەدلێر

ئەلفرید ئەدلێر ساڵی ١٨٧٠ لە ڤیەنا چاوی بە دنیا هەڵهێناوە ، منداڵی سێیەم بوو لە خێزانێکی پێکهاتوو لە حەوت منداڵ و باوانیش . کورو کچێك لە پێش ئەمەوە هاتوون . لە منداڵیدا دووچاری نەخۆشی بووەو بەهۆی کەمی خوێنەوە نزیك بووە لەوەی گیانی بسپێرێت لاوازیو بێتوانایی سەردەمی منداڵی تەنها کاری لە تەندروستی نەکردووە بەڵکو کاری کردۆتە سەر لەش و لاری ، کە ئەمەش زۆر پاڵی ناوە هەتا ئەرکێکی زۆر بکێشێت بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێت لای کەس و کاری مەقبول بێت .

لە خوێندنیدا قوتابیەکی ئاسایی بوو، جارێکیان یەکێك لە مامۆستاکانی ئامۆژگاری باوکی دەکات کە بینێرێتە کارگەی دروست کردنی پێڵاو چونکە لەو بروایەدا بوو کە ئەو جۆرە ئیشە نەبێت هیچی تری پێناکرێت ، جارێتر ئەدلێر هەوڵێکی زۆریدا تا ببێتە چاکترین قوتابی لە پۆلەکەیدا ، تەنانەت لەو بابەتانەش کە تێیدا لاواز بوو بۆ نموونە ماتماتیك .

ئەدلێر چووە قوتابخانەی پزیشکی ڤیەناو بەو بیرو

بۆچوونە سەرسام بوو کە دەیگوت دەبێت پزیشك چارەسەری گشتی نەخۆش بکات ، نەك هەر چارەسەری ئەو نەخۆشیەی دووچاری بووە . هەروەها زۆر بەو ووتەیەش سەرسام بوو کە دەڵێت :

« ئەگەر دەتەوێت پزیشکێکی لێهاتوو بیت ، مرۆڤێکی چاك بە »

ئەدلێر ئاراستەی رامیاری سۆشیالیستانە بوو، کۆمەڵناسیو زانستی ئابووری خوێند ، بەڵام گرنگی بە بیرو باوەری رامیاری مارکس نەدا . بەڵکو ئاراستەی سۆشیالیستیە مرۆڤاتیەکەی پاڵپشتی یەکسانیو هاریکاری نێوان کۆمەلانی خەڵکی دەکردو داوای دیموکراسی کۆمەلایەتی دەکرد . لە سەرەتاوە وەك پزیشکی چاو کاری دەکرد . پاشان بووە پزیشکی گشتی و دوای ئەوەش لای دایە لای خوێندنی کۆئەندامی دەمارو دەروندا . نەخۆشەکانی واتە ئەوانەی سەریان لە عەیادەکەی داوە دەڵێن گوایە لە منداڵیدا نەخۆش کەوتوون و هەستیان بە لاوازی کردووە لەو ساتەدا ، بەهۆی وەرگرتنی ئەم زانیاریانەوەو ئاگاداری تایبەتی ژیانی ناخۆشی منداڵی خۆیەوە چۆنێتی – سەرکەوتن بە سەر ئەم چەڵەمانەدا تێگەیشتووە .

چونکە ئەم هۆکارانە رۆڵێکی گرنگیان هەبووە لە چاندنی تۆوی بیری هەست بە کەم و کوری کردن و کار تێکردنیشی لە سەر رەفتاری مرۆڤ .

لە سەرەتای ئەم سەدەیەداو ، بە تەواویش ساڵی ١٩٠٢ پەیوەندی ئەدلێرو فرۆید دەستی پێکرد . فرۆید داوای ئەوەی دەکرد کە کۆببنەوەو لە ماڵەکەیداو لەگەڵ زانایانی تری دەروونناسیدا کار بکەن بۆ پێکهێنانی قوتابخانەی دەرون شیکاری . (نۆ) ساڵ پێکەوە کاریان کرد ، بەلام بە درێژایی ئەم نۆ ساڵە ئەدلێرو فرۆید پەیوەندیەکی بە تینیان لە نێواندا دروست نەبوو ، جگە لەمەش ئەدلێر ئارەزووی ئەوەی نەبوو کە پەیوەندیەکی بەهێز لەگەڵ هەر ئەندامێکی تری کۆمەڵەکەدا بنیات بنێت . ساڵی ١٩١٠ ئەدلێر بە یەکەمین سەرۆکی کۆمەڵەی دەرون شیکاری ڤیەنا هەڵبژێررا . ساڵی ١٩١١ دەستی کردە ئاشکرا کردنی بیرو بۆ چوونەکانی لە نێوان ئەندامانی یەکێتی دەرون شیکاران دا ، کە ئەم بیرو بۆ چوونانەش پێچەوانەی بیرو بۆ چوونی فرۆید بوون . وەلام دانەوەی ئەندامانی کۆمەڵەکە بۆ ئەدلێر زۆر توند بوو ناچاریان کرد کۆمەڵەی دەرون شیکاری ڤیەنا بەجێبهێڵێت و کۆمەڵەیەکی تر پێك بێنێت کە پێی دەوترا (کۆمەڵەی توێژەرەوانی ئازاد لە دەرون شیکاریدا) دوو ساڵ ، واتە ساڵی ١٩١٣ ناوی ئەم کۆمەڵەش گۆڕا بە ناوێکی تر کە «دەرونزانیتاکی» بوو .

ئەوەی بە ئەدلێرەوە دیار بووە هەر لە سەرەتاوە رووی تێروانینی بۆوە بۆ مرۆڤ لە هەموو لایەکەوە ، نەك روانینە لایەنێکی دیاری کراوی رەفتارو هەڵس و کەوت . یەکێك لەو بنەمایانەی کە ئیحای زاراوەی «تاکانە» یان «تاکی» لا دروست کردووە روانینێتی بۆ مرۆڤ وەك و یەکەیەکی تەواوو تەواو بوو .

ئەدلێر لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا وەك پزیشك لەسوپادا لە نەخۆشخانەی ڤیەنا کاری کرد ، ئەم تاقی کردنەوەش سوود بەخش بوو بۆی بە تایبەتی ئەو بەدبەختیەی کە جەنگ پاش خۆی خوڵقاندی . ئەدلێر لە نووسراوەکانیدا پێ لەسەر یەکێتیو خۆشەویستیو رێزی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ دادەگرێت .

لە سەرەتای بیستەکاندا (١٩٢٠) ئەدلێر ناوبانگی پەیدا کردو زاناکان دانیان پێدانا . بانگهێشتن و گەشت و سەردانی دەستی پێ کرد بۆ موحازەرە دان ، سەری وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای داو بیرو باوەرەکانی بۆ ئەو کەسانە باس دەکرد کە دەهاتنە گوێ گرتن موحازەرەکانی . ساڵی ١٩٣٧ کاتێ بە گەشتێك هەڵدەستا بۆ گووتنەوەی چەند موحازەرەیەك تووشی «النوبە القلبیە» بوو لە ئەنجامدا لە ئەبەردینی سکوتلاندا) گیانی سپارد .

**سەرچاوەکان**


١ـ شلتز ، دوان نظريات الشخصية ، ترجمة حمد ولي لكربولي وعبدالرحمن القيسي جامعة بغداد ، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي ، مطبعة جامعة بغداد ، (١٩٨٣)

2- Adler , A. The Scince of Living .

3- Adler , A. Advantages and disadvantages of the inferiority feeling.

4- Adler , A. on the origins of the Striving for Superiority and ofsoul interst .

5- Ansbacher , H.L. and Ansbacher , R.R. The individual Psychology of Alfred Adler.

6- Furtmuller , C. Alfred Adler : Abiographical Essay

7- Ryckman , R.M. and Sherman , M,F. Locus of Control and attitudes of workers and College Studeuts .

8- Rychman , R.M. The Theories of Personality .


ئەم باسە نووسینی قاسم حسین صالح و لەگۆڤاری آفاق عربیە عدد ١٠ تشرين الاول ١٩٨٧ ل ل ٦٦ ـ ٧٢ دا بڵاوی کردۆتەوە

# • ڕوونكردنەوەیەك •

• كاروان •

ئەوەی ڕاستی‌بێ لە ژمارە «٦٩»ی گۆڤارەكەماندا ، كەهی مانگی تشرینی یەكەم و دووەمی ساڵی «١٩٨٨»ە ، لە گۆشەی «ڕۆشنبیریی گشتی» و «فۆلكلۆر»دا دوو بابەتی بەپێزی دوو برای خۆشەویست و ئازیـزمـان بڵاوكـردوونـەتـەوە، كە **یەكەمیان**:بەم ناونیشانەیە : «ئاسنگەری لە كوردەواریدا» ، لاپەرە «٨٤» تا لاپەرە «٨٧»ی گرتۆتەوەو كاك «ئەحمەد حەیران» نووسیویەتی .. **دووەمیشیان** : بەم ناونیشانەیە : «سەرەتای خۆڵقـان لە دەقـەكـانی كوردیدا» ، لاپـەرە «٩٠» تا لاپـەرە «١٠٣»ی گرتۆتەوەو ، كاك «طارق جمباز» نووسیویەتی ..

ئەوەی مایـەی نیگـەرانیی ئێمەیە ، هەردوو بابەتەكە هەڵەیان تێكەوتووە ؛ **یەكەمیان** ؛ واتە بابەتەكەی كاك «ئەحمەد حەیران» ، لاپەرە «٨٦»ی بەتەواوەتی پەریوەو ، هەمان لاپەرەی ژمارە «٦٨»ی مانگی ئەیلوولی گۆڤارەكەمانی لە شوێن داندراوە ، كە لە ئەسـڵا هی بابـەتـەكـەی برای نووسەر كاك «جەلال تەقی»یەو، لە ژمارەی پێشوودا بەناوی «گۆگۆڵ»ەوە بڵاوبۆتەوە . ئەڵبـەتـە ئەمـەیش هەڵەیـەكی هونەریی چاپخانەیەو ، لە ئیرادەی ئێمە بەدەرە ، لێرەدا دەبێ ئەوە بڵێین : گەر بهاتایە یا چاپخانەكە لە ئێمە نزیك بوایە ، وەیا ئێمە لە چاپخانەكە نزیك بووینایە ئەوە ئەم جۆرە هەڵانە كەمتر دەبوون .

جا بۆ ئەوەی دڵی كاك «ئـەحـمـەد حەیـران»و ، خوێنـەرانیشمـان لێ نەیـەشێ وا دەقی لاپـەرە پەریوەكە بڵاو دەكـەینـەوە ، هیـواداریـن لێمـان ببـوورن و ، پێشـەكیش سووپاستان دەكەین ..

جۆری وەرگرتوە . لەسەرەتادا كورەی ئاسن توانەوە یان نەرم كـردنەوە بە هەوای پێستە گەرمكراوەیان سوركراوەتەوە كە بەم جۆرە بوە . چەند تەختە دارێكیان هێناوە سەری دارەكانیان خۆش كردوە بۆ ئەوەی بچنە ناو یەك بەم كارە تەختە دارەكان شێوەیەكی گەورەو پانیان وەرگرتوە . بۆ ئەوەی بەتەواوی دڵنیا بن كە ئەم دارە هەوا نادا ئەوا بە جۆرە مادەیەك كە پێی دەڵێن (ئەسرێلك) وەكو سمغ وایە لێی دەدراو پارچە پێستێكی لەسەر ڕادێخرا . بەم جۆرە چوار تەختە داری گەورەیان ئامادە دەكـرد ئینجا بە جوت سەری دارەكانیان دەگەیاندەوە یەكـتری لەم شوێنەی سەری تەختەكان پێك دەگەیشتن دارێكی باریكی درێژ لەنێوانیان توند دەكـراو سەری تەختێ لە تەختەكان بڵندتر دەبو بەم دارەیان دەگوت (ملە) لەلاكەی تریش دارێكی تریان بەهەمان ناوو جۆر دادەنا ئینجا چەند دارگەزێكی باریكیان دەهێنا لەبەینی ئەم دوو ملەیان بەشێوەی كەوان توند دەكرد ئینجا پێستێكی گەورەیان بەسەر دایەدا سەری پێستەكە لەم سەرم لەوسەری هەر دوو تەختەدارەكە بزمار ڕێژ دەكرا . بەم شێوەیە لایەك تەواو دەبو لاكەی تریش بە هەمان شێوە دەكرا . ئینجا هەر دوو لابەشێوەی تایبەتی خۆیان چەسپ دەكرانو شوێنی زەلامێك لەنێوانیان دەمایەوە بۆ كاركردن كە ئەمیش بەم جۆرە بوو . شاگردەكە دەچووە بەینی هەردوو لا دارەكان كەشوێنی‌دەستیشی‌بۆ كراوە بۆ گرتن . ئینجا لایەكی پاڵدەداو لاكەی تری بۆ خۆی ڕادەكێشا . بەم جۆرە هەوا دەكرایە كورەكەو گەرم دادەهات ئەم هەوایەش بەبۆری لە تەختەدارەكانەوە بۆناو كورەكە دەچوو ئەوەی شایانی وتنیشە كونێكی بچوك لەم تەختەیەی كە شاگردەكە هاتوچوی پێ دەكرد هەبووە بۆ ئەوەی هەوا بچێتە ژورەوە لەژورەوەش پارچە دارێك بە ڕێزەی لەسەری كونەكە دەدرا بۆ ئەوەی هەواكە نێتە دەرەوە لەكاتی هێنانوبردن . پێویستە ئەمەش بگرترێ ئەم بۆریانەی لەم لاو لەولای دارەكانەوە دەهاتنە دەرەوە هەردوكیان تێكیان دەكردەوە دەبونە یەك بۆریو بۆناو كورەكە دەچون .

ئەوەی شایانی گوتنیشە لە رۆژگاری کورە بەم شێوە کاری کردووە، رەژو بەکارهاتووە واتە (١٢٠) [illegible] کاری کردوە .
بۆ سوورکردنەوەو گەرم کردنەوەی ئاسن؛ بەلام پاشان بەپێی گوڕان و [illegible] پێشکەوتنی رۆژگار گۆڕاوەو شێوەی جیاوازی بەخۆوە گرتوە ، پاش ئەوەی نەوت دۆزراوەتەوە رەژوو لابراوەو نەوت بۆ سورکردنەوەی کورەکە کەلکی لێوەرگیراوە لەدوای ئەوەی کارەبا گەیشتۆتە ئەم ولاتە شێوەی هەوا کردنە کورە بەم جۆرەی باسمان کرد ئەویش گۆڕاوەو ماتۆری کارەبایان بەکار هێناوە بۆ هەوا کردنە سەرنەوتەکەو سورکردنەوەی کورەکە ، ئەمە بەردەوام بووە تا گەیشتۆتە رۆژگاری ئەمرۆ بەلام ئێستا کاری ئەم جۆرە لایەنە کەم بووەوە بە تەواوی شێرازەی ئێك پچڕاوە بەرەو خاشەبڕی دەچی لە شارێکی وەکو هەولێر تەنیا یەك کورەماوە .

**شێوەی کارکردن :-**

شێوەی کارکردن لە کورەی ئاسن لەکۆنەو ـ تاوەکو ئێستە ، رۆژانە بووە . بە گوێرەی رۆژگارو سەردەم ئەو رۆژانەیەش کوراوە . لە هەر کورەیەکیش چەند شاگردێك هەبووە . زۆریش لە دەوری (چوار تا پێنج) کەس بوونە لەوانە یەك دوانیان منداڵ بونە ئەوانی تریش گەورە . گەورەکان عادەتەن بۆ لێدانی ئاسن لەسەر دەزگا کاریان کردوە . منداڵەکانیش بۆ هەواکردنە کورەو وردەکاری تر . ماوەی کارکردنیش دیاریکراو نەبووە بەڵکو (ئەو تاریك و ئەو تاریك) بووە واتە لەبەیانی پێش ئەوەی رۆژ دەربێ کارکراوە تاوەکو رۆژ ئاوا بووەو دنیا تاریك داهاتووە . واتە لە تاریکایی بۆ تاریکایی ، هەندێك لە شاگردەکان دەڵێن ، ئەوکات کار ئەمەندە کەم بوو خەڵك منداڵی دەنارده کارکردن زۆر جار دایك و باوك بە خاوەن کورەکەیان دەوت هاتوە منداڵەکەمان ئیشی پێ بکە (گۆشتەکە بۆ تۆ ئێسکەکە بۆ مە) هەروەها دەڵێن کارکردن ئەمەندە بە زەبرو زەنگ بوە زۆر جار خاوەنی کورە یان کارگە ئەگەر کارێکی هەبایە یاخود شاگردێکی بۆ شوێنێ رەوانە بکردایە (تفێکی لەسەر زەوی رووەدەکرد دەیگوت تا دەگەرێیەوە نابێ ئەم تفە وشك بێ) . هەر وەها دەڵێن کاری ئەم جۆرە لایەنە ئەمەندە ناخۆش بووە . شمەکی شاگردەکان ئاوی لێ دەهات لەبەر ئارەقەکردن لە حالەتێك ئەگەر بتگوشیبا ، بۆیە دەیان کەس توشی نەخۆشی دەبونو دەمردن بەرگەی ئەم جۆرە کارانەیان نەدەگرت .
بەلام دەربارەی کرێی دەستی بازوی شاگردەکان ئەوا شێوەیەکی جەسپاوی نەبووە ، بەڵکو ئەمیش لە گۆڕانێکی بەردەوامدا بووە ، بۆ نموونە [illegible] هەندێك تشك دەخەینە سەر ئەم لایەنە بەگوێرەی تەمەنی ئەو کەسە [illegible] سەمەی [illegible] سەر [illegible] رگیراوە دەردەخرێ .
[illegible] ٩٤٧ [illegible] ردی منداڵ لە کورەکانی ئاسن بە (٣) عانەی بەلام گەورەکان واتە ئەمانەی چەکوشیان وەشاندووە بە (٦) پەنجایی کاریان کردوە . ئەمە وابووە تا شۆرشی (١٩٥٨) لە پاشا بوەتە (٨) پەنجایی پاش یەك دوو ساڵ تێپەربون بەسەر شۆرشەکە بووەتە (١٢) پەنجایی . هی منداڵیش هەروا بوەتە (٢ - ٣) پەنجایی . یەکێ لە شاگردەکان دەڵێ لەساڵی (١٩٥٨) کە داخلی جقات بوین وەستایەکان واتە خاوەن پشیەکان لە خۆیانەوە کرێیان بۆکردینە (٨) پەنجایی . ئەمە وابوە تاساڵانی (١٩٦٨)

دەربارەی بابەتەکەی کاك «طارق جمباز»یش ، کە لەلاپەرە «٩٠»دا بڵاوبۆتەوەو ، بەم ناونیشانەیە

## ●ـ سەرەتای خوڵقان لە دەقەکانی کوردیدا :

لەم بابەتەیشدا ، ئەم هەڵانەی خوارەوە وەبەرچاو دەکەون کە لەکاتی راستکردنەوەی بابەتە تەرتیب کراوەکەدا تێپەریوەو ، هەستی پێ نەکراوە ، ئەمانەیش هەڵەکانن :

● **یەکەم** : ئەم ژمارانە «١ ، ٢ ، ٧ ، ٨ ، ٩»پەراوێزیان بۆ دانراوە ؛ بەلام لەکاتی تەرتیب کردنی بابەتەکەدا نەخراونەتە سەر ئەو شوێنانەی کە نووسەر دیاری کردوون ؛ وەك ئەمانەی خوارەوە کە راستکراونەتەوە :

١ـ سەرەتای خوڵقان[1] لە دەقەکانی کوردیدا : لاپەرە «٩٠» ناونیشانی بابەتەکەیە .

٢ـ دەقی قەولی ئافـرینـا دنیایێ[2] : لاپەرە «٩١» ، ستوونی دووەم ، سێ دێر بەر لە کۆتایی هاتنی ستوونەکە .

٣ـ زەوی لەسەر پشتی ماسییە[7] .

٤ـ خالیق حەفتا هەزار ساڵ بەتاك و تەنیا بوو[8] :

٥ـ ئادەمیزاد لە چوار «عونسر» لە خاکی سەرەندیل پێکهاتووە[9] :

ئەم سێ برگـانـە کەوتوونەتە ستوونی یەکەمی لاپەرەی «٩٨»و ، بەم جۆرە ، دێری : «١٤ ، ١٦ ، ١٨» پێك دێنن .

● **دووەم** :

لاپەرە «٩١» ستوونی یەکەم ، دێری پانزەهەم ، دوای ووشـەی «وەك» ، ئەم برگـەیە پەریوە : «وەك شتێکی دەست

نیشان نەکراو .

● سێیەم

لە لاپەرە «٩٨» ، دوای دێری «١١» ، ئەم نووسینە زیادەیەو ، بە هەڵە دابەزیووەو ، هیچ پەیوەندی‌یەکی بە بابەتەکەوە نی‌یە : «من ص [٣٠] الی ص [٤٠] إسطوانە ٨ قناة ٢» .

● چوارەم :

دوا دێری برگەی «٦»ی ، ستوونی دووەمی لاپەرە «٩٦» ووشەیەکی پەڕیوەو ، بەم جۆرە تەواو دەردەچێ :

«**باڵێدا** بەریەك دانیشتنە ڕوی هەوا» .

● پێنجەم :

لە برگەی سێیەمی ، ستوونی دووەمی ، لاپەرەی «١٠٣»دا ، لەبەشی سەرچاوەکان : ئەم دوو برگەیە پەڕیوون :

ل / ١٥٧ ـ ل / ١٨٤ ؛ ل / ١٨٥ ـ ل / ١٩٣ .

● شەشەم :

لە لاپەرە «١٠٠»داو ، لە ستوونی دووەم ، ئەم ڕوونکردنەوەیە لە بیرکراوە : «دەقە بڵاونەکراوەکەم لە برای شاعیر کاك «کەریم دەشتی» وەرگرتووە ، ئەویش بە دەوری خۆی لە «ئەحمەد زەری»ی وەرگرتووە ، ئەویش لە یەکێکی دیکە ، پڕ بەدڵ سوپاسی هەموویان دەکەم .

● حەوتەم :

لە ڕاستی‌دا ئەو پەرەگرافەی دووای خاڵی سێیەمی ستوونی یەکەمی‌ی لاپەرە «١٠١» ، لە شێوەی نەخشەدایە : بەڵام لەوێدا بە شێواوی بڵاوبۆتەوە ، ڕاستیەکەی بەم شێوەی خوارەوەیە :

● چۆنیەتی خوڵقان لە هەموو دەقەکاندا :

| ئافرینا دنیایێ (ئیزدی) | زەبوونی مەکسور (ئیزدی) | سروور (کاکەیی) | پەخشان (کاکەیی) | دەقێکی بڵاونەکراوە |
|---|---|---|---|---|
| بەهر «بەحر» | بەحر | دەریا | دەریا | با |
| ڕووناکی | ڕووناکی | ئاسمان | هەوا | زەوی |
| ئەرد «زەوی» | عەزمان «ئاسمان» | زەوی | ئاسمان | ڕۆژ |
| ـــــ | ـــــ | ئادەمیزاد | ئەستێرە | ئاسمان |
| ئەزمان «ئاسمان» | عەرد «زەوی» | ـــــ | مانگ | شەو |
| داروبەرە | شینایی «نەبات» | ـــــ | خۆر | مانگ |
| شینایی | ـــــ | ـــــ | شەو | ئەستێرە |
| ئادەمیزاد | ئادەمیزاد | ـــــ | ڕۆژ | هەوروباران و ڕووبار |
| حەیوان | ـــــ | ـــــ | زەوی | ئادەمیزاد |
| «تەیروتوال» | ـــــ | ـــــ | ئادەمیزاد | حەیوان |
| ـــــ | ـــــ | ـــــ | ئینس وجینس | با |

# ژ كەڤنە رەوشت و تیتالێت كوردان

● حجي جعفر ●

هەر ملله‌تەك خودان رەوشت‌و تیتالێت خۆیێت تایبەتی‌نە . رەهێت ڤن رەوشت‌و تیتالا دگەهنە كەڤناتیا مێژووا ملله‌تا . هەر ملله‌تەك خۆ ب (عادات‌و تەقالیدێت) خۆیێت خۆمالی دەتە نیاسین . كوردا راست گوتیە دەمێ گوتی :

(هەرنە ملله‌تا بگرن عەدەتا) . دیارە ڤێ پەندێ دڤێت بێژیت . رەوشت‌و تیتالێت خەلكی وەك هەڤ نین‌و ژێك جوودانە . لەوما هەكە مرۆڤ چوو ناڤ بیانیا . دڤێت ژرەوشت‌و تیتالێت وان دەرنەكەڤیت‌و فێری عەدەتێت وان بیت‌و وەكو وان ب رێڤە بچیت (عادات و تقالیت) . وەكو خو نامینن . هندەك تێنە بەرزەكرن‌و دمرن . چونكی چاخ‌و زەمانەكێ درێژ ب‌سەردا بورینەو ژكار كەڤتینە . هەر عەدەتەكێ ب‌كێر دەمێ خۆ نەهێت ، دێ هێتە هێلان‌و خەلك دێ ژبیركەت . وەكو ڤان عەدەتێت ، كو دێ دبن گوتنا مەبا ئەڤرۆڤە بن . گەلەك ژڤان عەدەتا ژی وەكو خۆ مابنەو بەردەوامن دژیانا كۆمەلایەتی‌دا . چونكی ب‌كێر هەمی دەم‌و جها تێت ، وەكو مەردینیێ‌و مێرانیێ ...... ، جارنا هەیە هندەك عەدەتێت دی دێنە سەر عەدەتێت ملله‌تەكی ، چ ژناڤ وان بخۆ بخۆ پەیدا بوین ، چ ژخەلكێ دەروجیرانا هاتبنە وەرگرتن ، وەكو عەدەتێ هەلگرتنا (عەباوپێچا) . كو كوردان پشتی ئیسلامێ ژعەرەبا وەرگرتیە .[1]

دگەل هندێ ، كو ئەڤە بابەتەكێ هێژاو بەركەڤتیە ، ستوینەكە ژستوینێت سەربەخویا نەوایەتی .... لێ ژبلی چیرۆك‌و چیڤانۆك‌و سترانا .. فولكلۆری . چ ژێدەرێت وەسا مە نین ، كو خۆ كوور داهێلینە ڤی بابەتی . لەوا باشترین ژێدەر ، هەر ملله‌تەو كەلەپوورێ ملله تیە ، گەریان‌و كۆمكرنا چیرۆك‌و چیڤانۆكا ، دێ ژمارەكا چاك ژڤان عەدەتێت كەڤن ، ب دەست مە ئێخیت[2] . چونكی چیرۆك‌و چیڤانۆك شەنگەستێ رەوشەنبیریا ملله تێت كەڤن[3] . وە نەبیت ئەڤ چیرۆك‌و چیڤانۆكە درەوبن‌و چ رەهـ بۆ نەبن . چیرۆك‌و چیڤانۆك . كارێ خو دكۆمەلی‌دا دكەن‌و كۆمەلی دپارێزیت . بەرنگاری رەوشت‌و تیتال‌و هزرو بیرێت خەلكی نابیت[4] ...چونكی چیرۆك‌و چیڤانۆك ژبهایێ سنجرو ئولی تێنە جوداكرن . زمانێ ملله‌تی بویە . دقوناغەكا تایبەتی‌دا[5] . لەوما ڤەكۆلین‌و گەریان . ل‌دویڤ چیرۆك‌و چیڤانۆكا . گەریان‌و ڤەكۆلینە . ل‌دویڤ هزرو بیرێت وێ گاڤێ‌و وی دەمی[6] .

ئەڤە ژی قەفتەكا وان عەدەت‌و تیتالێت كەڤنن . یێت كو كێم بوین . یان نەماین . دێ ژوەرا رێزكەین . هندە جارا ژی . دێ خۆ هاڤینە باغچێت خەلكەی‌و هندەك گوك ژێ قەتینین :-

**١ - سەرەدانا گۆرا :**

ددەمێ بەرێ‌دا ، بەری بووكێ ڤەگوهێزنە مالا زاڤای ب‌رۆژەكێ . یان ب‌دوو رۆژا ، دڤیا بووك بچیتە سەر گۆرێ دەیكا خۆ . یان بابێ خۆ . یان برایێ خۆ... وەكو دچیرۆكا (كەوكا گۆزێ) دا دەردكەڤیت . دەمێ (كەوكا گۆزێ) شوی دكەت ، بەری ببەن ، دێ چیتە سەر قەبرێ باب‌و براو دەیكا خۆ...

یان ژی هەكە ، داوەتی دبەر گۆرستانەكێ‌را چووبانەو مرۆڤەكێ بووكێ ل‌وێ كۆرستانێ هاتبا ڤەشارتن ، بووك ل‌سەرا نە دبووری . هەنا نەچووبا سەر گۆرێ وی . یان وێ .... وەكو دچیڤانۆكا (عەین الحیاة)ێ‌دا خویا دبیت ، دەمێ (عەین الحیاة) ، دبێژتە (سلطانی) ، (هوین هەرنە درێكی‌دا ، قوبەكا دنیڤا رێ‌دا ، هەرنە تێڤە ، وەختێ دەهواتا من تێتە

راستا قوبێ ، ئەز دێ بێژمە وان ئەڤە زیارەتێ پیرا منە ، چێنابیت ئەز ، ل سەرا بورم ، دڤێت سەرا بدەم ....)هەتا ئەڤرۆکە ژی ، رۆژێت ئەینیو پێنج شەمبی ، کورد دچنە سەر گۆرێت مرییێت خۆ ، لێ ئەم نزانین کانێ بەری ئیسلامێ ، کورد چ رۆژ دچوونە سەر گۆرا .... دوور نینە چیرۆکەك ، چیڤانۆکەك ب‌دەست مە بکەڤیت ، ڤێ ژی ژمەرا خویا بکەت .

**٢ – فنجانا شەرتا :**

ژعەدەتێت کە ڤنێت کوردان ، دەمێ ڤیابان بچنە شەرەکی ، دا مەزنێ ئێلی فنجانا شەرتا – فنجانا قەهوێ بو – دا داتە سەر دەستێ کچا خۆ و دا ددیوانێ‌دا گێرێنیت ، هەچیێ فنجانا قەهوێ ، ل سەر دەستێ وێ راکربایە ، ئەو دا بەری هەمیا چیتە شەریو کچك دا بۆ وی بیت .... وەکو دچیرۆکا (دەروێشێ عەڤدی)دا خویا دبیت ، دەمێ (زۆرتەمەر پاشایێ مللی) ، فنجانا قەهوێ دانایە سەر دەستێ کچا خۆ (عەدولێ)و ددیوانا مێهرسو پالەوانادا دگێرینیت ، لێ ژئێلی دەروێشێ کورێ شێخ عەڤری ، کەس فنجانا قەهوێ ، لسەر دەستێ (عەدولێ) هەلناگریت ......

دچیرۆکا (کورکێ سلێ)دا ، دەمێ مامێ (کورکی) دڤێت (کورکی) بتەلێڤیت ، دێ فنجانا شەرتا داتە نیڤا دیوانێو بێژیت :

هانە سەد جار ، بەمن هانە
هەچیێ ڤەخوت ، فنجانا شەرتانە
بچیتە (جانجانا) ، عەلیانو مەلیانە
دێ دەمێ کچا خۆ (گولیخانێ) ، قەویا جانە

دووجارا دبێژیت ، کەس راناکەت ، جارا سێ ، (کورك) رادکەتو دبێژیت :

هانە سەد جار ، بەمن هانە
ئەز دێ ڤەخۆم ، فنجانا شەرتانە
دێ چم (جانجانا) ، عەلیانو مەلیانە
بدە من دوتماما من ، (گولیخانێ) قەویا جانە

دهندەك چیرۆکو چیڤانۆکادا ، دەمێ پالەوان فنجانا قەهوێ لسەر دەستێ کچکێ رادکەت ، راموسانەکێ ژی لێ ددەت ....

**٣ – تەیرێ دەولەتێ :**

ژعەدەتێت کوردان ، دەمێ حاکمەك ، یان سلطانەك راکربایە ، دا (تەیرێ دەولەتێ) هەلاڤێژن ، ڤێجاتەیر چووبا سەر سەرێ کێ ؟ ئەو دا بیتە سلطان ، یان حاکمێ وی باژێری – بارا پتر دادا سەر سەرێ ئێکێ بیانی – هەرچەندە ئەڤ تەیرە خەیالیەیە ، وەکو تەیرێ سیمەرخێ ، بەلێ رەهێت راستیێ تێدا هەنە ، وەکو چیرۆکا (سلطان سعید) ، دەمێ سلطان (سعید) چوویە نك سوفی گوتیێ :

(ئەرێ سوف ، تو نابێژی ، چ لڤی باژێری قەومیە ؟

سوفی گوتێ خالو ، حاکمێ مەیێ مری ، ڤێجا مرۆڤێت باژێری هەمی ، بێت چوونە مەیدانا هەنێ ، دێ تەیرێ دەولەتێ هەلاڤێن ، هەچیێ تەیرێ دەولەتێ دادا سەر سەرێ وێ ، ئەو دێ بیتە حاکم ... چوو وێرێ ... تەیرێ دەولەتێ هەلاڤێت ، تەیر گەریا ، دوو سێ جارا ، ل دۆر باژێری زڤری ، هاتە راست (سلطان سعید) ، دادا سەر سەرێ سلطانی ...) کی دبێژیت ، ئەڤ تەیرە ژی ، وەکو (حمام الزاجل)نەبویەو ئەڤ دیمقراطیە ژی نەبویە ؟ ! !

**٤ – خوازگینی :**

ژعەدەتێت کوردان ، هەر مالەکا خودان کچ بوایە ، بەرێ خۆ یێ خوازگینیێ هەبو ، یان شڤکا خوازگینیا هەبو ، یان ژی زەنگلا خوازگینیا هەبو ، ڤێجا هەکە ئێك چووبا خوازگینیا کچا وان ، دا چیتە سەر وی بەری ، شڤکا خوازگینیا لبەری دەت ، ئانکو ئەزێ هاتیمە خوازگینیێت کچا وە ، یان ژی دا زەنگلا خوازگینیا هژبنیت ، ئانکو مە دڤێت کچا وە بخوازین ، وەکو دچیرۆکا (مەلاو تەرزی)دا خویا دبیت ، دەمێ تەرزی دگەهنە مالا کچکێ سێ جارا شڤکا خوازگینیێ لبەری ددەت ، بابێ کچکێ گوت ،

ئەرێ لاوێ دەلال ، تو بۆ خوە دخوازی ، یان بۆ ئێکێ دی ؟

..... لاوێ دەلال ، نەختێ من گرانە ، بەلکی ژتە نەهێت ، بەری تە گەلەکا شڤکا خوازگینیا لێ‌دایە ... پاشی بێت زڤرین ب‌شەرمزاری .....

یان دچیڤانۆکا (ئەحمەد چەلەبێ)دا دیار دبیت ، دەمێ (عەبدێ) ئەحمەد چەلەبی ، کچا حاکمی بۆ خوازتی ، دبێژیت :

(.....رابو دگەل عەبدی راست چوونە کۆچکا حاکمی ، دەستێ خۆ هاڤێتە زەنگلا خوازگینیێو هژاند .... گوت بێژە حاکمی ، ئەز خوازگینیێت کچا ویمە .....) .

دوور نینە دکەڤن‌دا (عەبدی) دەورێ خوازگینیا دیت بیت ، چونکی ئیبراهیم پێغەمبەر ژی داخواز ژعەبدێ خۆ کر بو ، کوژنەکێ بۆ کورێ وی (اسحق)ژکنعانیا نەهینیت ، بەلکو ژئێلو عەشیرەتا وی بخو بینیت . [٧]

دیارە ژەرهندێ بویە ، چونکی کۆمەلا کنعانیا کۆمەلەکا (دەیکی)

ئ‍ه‌یه‌ . ڤێجا ئیبراهیم پێغمبه‌ر خوازتیه‌ بۆ كورێ خۆ ژنه‌كێ ژكۆمه‌لا (ئ‍ـترپاركی) بینیی ، كو ئێلا وی ژڤێ كۆمه‌لێ بویه (٨) ....

دوور نینه‌ لنك (قومێ)ئیبراهیم پێغمبه‌ر عه‌ده‌ت بویه‌ ، كو نابیت ژنێ ژده‌رڤه‌ی ئێلا خۆ بینن ، هه‌ر وه‌كو لنك عه‌ره‌با عه‌ده‌ت بو ... به‌ری ئیسلامێ دڤیا عه‌ره‌ب ژنێ ژعه‌شیره‌تا خۆ بینن ، هه‌كه‌ ئێكی ژده‌رڤه‌ی عه‌شیره‌ تا خوژن هێنابایه‌ دا بـزنابێ زانن و ڤیابا مێره‌ك بێته‌ ئێشاندن(٩) ئه‌ڤ ره‌وشته‌ لنك هنده‌ ئێل و عه‌شیره‌تێت كوردان ژی هه‌بویه‌ .. (الاكراد ، فاسیل نیكیتین ، بیروت ، ١٩٦٧ ، ل ٩٨ ....)

**٥ - ماركرن :**

ژكه‌ڤنه‌ عه‌ده‌تێت كوردان ، هه‌ر ژبچویكاتی دا كورو كچا ، ل ئێك ماركه‌ن(١٠) ، نه‌ك هه‌ر ئه‌ڤه‌ ، به‌لكو هێشتا دزگێ ده‌یكێت وان‌دا ، گۆتن دگه‌ل ئێك دگوتن ، ئانكو ئاخفتن دا هه‌ڤ ، كو كورو كچێت خۆ بده‌نه‌ هه‌ڤ ، وه‌كو دچیرۆكا (ستێ و فه‌رخا)دا خویا دبیت ، ده‌مێ بابێ (ستێ) دبێژته‌ برایێ خۆ ، ژنێت مه‌ هه‌ردوو بـخالن ، هه‌كه‌ من كوره‌ك هه‌بو ، ئۆ ته‌ كچه‌ك ، تۆ كچا خۆ بده‌ كورێ من ، هه‌كه‌ من كچه‌ك هه‌بو ، ته‌ كوره‌ك ، ئه‌ز دێ كچا خۆ ده‌مه‌ كورێ ته‌ .....

بێگومان چونكی ئالۆزی و نه‌خۆشی ژڤی عه‌ده‌تی په‌یدا بوینه‌ ، له‌وما هاتیه‌ هێلان ....

**٦ — پرچ برین :**

ژعه‌ده‌تێت كوردان ، ده‌مێ مێرێ ژنكه‌كێ ، یان برایێ وێ ، یان عه‌زیزه‌كێ وێ مربایه‌ ، یان هاتبا كوشتن ، دا كه‌ زێت خۆ بریت هاڤێته‌ سه‌ر كێلێت وی ، هه‌رچه‌نده‌ ئه‌ڤ عه‌ده‌ته‌ كێم بویه‌ ، لێ هێشتا دناڤ كوردێت ئێزدی‌دا مشه‌ مایه‌ ، بـتایبه‌تی لـگوندێت ده‌ڤه‌را سێمێلێ ، هه‌كه‌ تۆ بچیه‌ ناڤ گۆرستانا گوندێ (مام شڤان) ، دێ بینی ، بـده‌ها قه‌ڤێت كه‌زیا خۆ لـسه‌ر كێلیا شوركرینه‌ خوارێ .... كوردناسێ هێژا (توما بوا) ڤی ئه‌ڤ ره‌وشته‌ دپه‌رتوكا خۆدا نڤیسیه‌(١١) .

سترانه‌كا كوردی ، ڤ عه‌ده‌تی ژمه‌را دپارێزیت ده‌مێ دبێژیت :

برانۆ مه‌ هاتیه‌ شه‌رێ نه‌ بـخێرێ ،

برا مالا كافرێ گه‌رمان ، نه‌خانا خوه‌دێ ،

هه‌تا دبێژیت :

**تێله‌كێ بده‌ گوندێ حه‌كۆرا ، بێشه‌عرێ —**

**(گولی‌برێ) ئالماستێ ، (كه‌زی برێ) ،**

**وه‌ره‌ ئه‌مێ (پۆر گولیا) كۆركن ، مه‌لحه‌مه‌كێ چێكن شین وه‌لاتێ خه‌ریبا**

..... (١٢)

سترانا (ده‌لالی به‌رپێ)دا ، عه‌دولا كچا (تیمور پاشایێ مللی) ، چل بسك و گولێت خۆ دبریت ، ده‌ما جابا كوشتنا ده‌زگرێ وێ دگه‌هیتێ دبێژیت :

عه‌دولا ناسك ناسگران ، به‌رخێ خوه‌

شووندا لـمالا ڤه‌دگه‌رینه‌

(چێل بسك و گولێد)حه‌بده‌رێ

پیلكێد سۆرو موور ، دده‌به‌ر مه‌قه‌سێ دبرینه‌

....... (١٣)

ئه‌ڤ عه‌ده‌تێ پرچ برینێ ، دناڤ عه‌ره‌با ژی‌دا هه‌بو ، هه‌تا نهۆ ژی دناڤ هنده‌ك ئێلێت وان‌دا مایه‌ ، ده‌مێ (خالدێ كورێ وه‌لید) ، چوویه‌ به‌ر دلۆڤانیا خودێ ، ژن نه‌ما ژئێلا (بنی المغیرة) پرچا خۆ نه‌بری و نه‌ هاڤتیه‌ سه‌ر گۆرێ وی ... ئه‌غریقێت كه‌ڤن ژێ ، ده‌مێ خه‌مه‌كا گران بو په‌یدا بوایه‌ ، ژن و زه‌لامێت وان پرچا خۆ دبری(١٤) .....

**٧ — ژن ئینان پتر ژئێكێ :**

دیاره‌ كوردا حه‌ژ دوو ژنا نه‌كریه‌ ، له‌وما گوتیه‌ ، (خودانێ دوو ژنا ، شویتك كه‌ڤته‌ بن گونا)(١٥) .

زانایێ كورد ، مه‌لا مه‌حمودێ بایزیدی ، لـسالا ١٨٥٨ز نڤیسیه‌ : (بارا پتر ژكوردان ، ئێك ژن هه‌یه‌ ، كێم جار مرۆڤ دبینیت ، كو ئاغه‌یه‌كی دوو ، یان سێ ژن هه‌بن ....)(١٦) كوردناسێ به‌ركه‌ڤتی ، (توما بوا) دبێژیت ، كورد حه‌ژ دوو ژنا ناكه‌ن ، هه‌كه‌ هاتو پتر ژئێكێ ئینا ، ئه‌وێ ئه‌گه‌رێت خۆ هه‌نه‌ ، بـتایبه‌تی ئه‌گه‌رێت ئابووری .....(١٧) .

چیرۆك و چیڤانۆكێت كوردی ژی پشتگیریا ڤان هه‌ردوو نڤیسه‌ڤانا دكه‌ن ده‌مێ دبێژن ، حاكمه‌كی دوو ژن هه‌بون ، یان سێ ژن هه‌بون ، به‌لێ خودێ چ بچویك نه‌ دابونێ ..... ئه‌ڤه‌ وه‌سا دیار دكه‌ت ، كو ژن ئینان ژبه‌ر بچویكا ژی‌بویه‌ ..... ژبلی ئه‌گه‌را ئابووری .

٨ - رەڤاندن :

ژعەدەتێت کەڤن . رەڤاندن عەیب نەبویە[١٨] . ئانکو دەمێ بابێ کچکێ . کچا خوّ ب دلێ وێ نەدابا شوی . دا خوّ دەتە رەڤان ... ئەڤ کارە مشە دسترانێت کوردیدا هاتیە . هەروەسا مشە دچیروّك‌و چیڤانوکێت کوردیدا ژی هاتیە . بوّ نموّنە . دەمێ برایێت (سەیران خاتوینێ) . سەیران خاتوین . نەدایە پسمامێ وێ (عەلیێ مامەند) . برایێ وێ یێ بچویك زەلام‌بو هاریکاریا پسمامێ خوّ (عەلیێ مامەند) کر . هەتا خویشکا وی رەڤاندی ....

پارچە سترانەك ژی دبێژیت :

دێ رابە . هەکە تە مالەکێ گران هەیە .

بابێ من تەماع بکە . من ژخوّرا بینە

هەکە تە برەکا پسماما . خورتا هەیە .

من ژبابێ من بستینە

هەکە تە جانیکەك بەزەك هەیە .

من ژجانێ خوّرا (برەڤینە)

٩ - گوهـ برین :

ژعەدەتێت کەڤن . دەمێ ئێکی چەند کەسەك کوشتبانە . دا گوهێت وان ژی ژێڤەکەت بوّ نیشان - ئەڤە ب هەمی کەساڤە نەدهات . هەکە مێرەکێ چاك نەبا - وەکو دچیروکا (گورنیسك)ێدا دیاردبیت . دەمێ گورنیسك حەڤت کافرا دکوژیت . گوهێت وان ژی دبریت بوّ نیشان ... هەتا سالا (١٠٦٥ك) گوهـ برین‌و دڤن برین‌و هندە جارا سەر برین - هەکە یێ کوشتی بەرکەتیبایە - مشە لکوردستانێ هەبو[١٩] . نهوّ ژی گوتنەك دناڤ کوردانێدا هەیە دبێژیت . (پاشی دێ گوهێت وی ئینی ! !) لهندەك ملەتا زمان شوینا گوها دبرین بوّ هەمان مەخسەد[٢٠] ...

١٠ - قوربانیدان :

لدەمێ بەرێدا . هەکە ئاڤاهیەك دانابایە . یان ئاڤێ راست نەهاتباو هەر هەرڤیبایە . داکو نە هەرڤیت‌و خوّ بگریت . دا مروّڤەکی بوکەنە قوربان‌و کەنە دناڤ دیوارێ ئاڤاهیدا[٢١] . دچیڤانوّکا (پرا دەلالێ)دا . لزاخو . ئەڤ قوربانیە هاتیەدان . هەتا پرێ خوّ گرتی[٢٢] .

قوربانیدان بوّ ئاڤاکرنا کەل‌و ئاڤاهیا . لهەمی ئەوروپا هەبو . دەمێ ئاڤاهیەکی خراب دکەن . قەرقودێت مروّڤا . ب تایبەتی یێت بچویکا دناڤ دیوارادا دبینن .... ئەڤ عەدەتە هەتا چەرخێ نوزدێ لژووریا ئەلمانیا هەبو[٢٣] .

دیارە رەهێت ڤێ قوربانیدانێ هێشتا دناڤ کوردانیدا مایە . بەلێ قولپیە سەر حەیوانی . هەتا نهوّ یێ ئاڤاهیەکی ئاڤا بکەت . دێ قوربانەکی بوّ دەت . ئانکو دێ سەرەکی بوّ ڤەکوژیت . داکو ببیتە وارێ خێرێ .

١١ - بەرێ خودانا بویکێ :

نهوّ دەمێ ئێك ببیتە بووك . کچ‌و ژن‌و بچویك دچنە پێش‌و بەرێ خوّ دەنێ . لێ ددەمێ بەرێدا . دوور نینە زەلام ژی چووبنە پێش بووکێ . وەکو دچیڤانوّکا (گولا بن دونیایێ)دا خویادبیت . دەمێ پیرەژن دبێژتە (ئەحمەد) :

(سوباهی نەء ... دوو سوبە . دێ (گولا بن دونیایێ) کەنە بویك‌و خەلك دێ هێت بەرێ خوّ دەتێ . بەرێ ئەم ژنك دچین بەرێ خوّ دەینێ . پاشینگێ زەلام ...) .

دوور نینە هێشتا ئەڤ عەدەتە لهندە قورنەتێت کوردستانێ مابیت....

١٢ پسمام‌و دوتمام :

**هەر ژمێژەوەرە عەدەتێت کوردان ئەو بو . دوتمام دڤیا بوّ پسمامی بیت . وەکو دچیڤانوّکا ئەحمەدو گولستانێ)دا دیاردبیت . نەك هەر ب مەزنی . بەلکو دچیڤا نوّکا (گولێ‌و نەزیر)دا . هێشتا گول دزگێ دەیکا خوّدا نەزیر دبێژیت : (ژنماما من ب حالەکی بی . من گوتە خوە . هەکە کچەك بی . ئەز دێ بوّ خوە ئینم ...) .**

**دچیڤا نوّکا (ئەحمەدو گولستانی)دا . ئەڤ عەدەتە هاتیە . دەمێ ئەحمەد چەلەبی دچیتە نك گولستانێ دبێژتێ :**

**(بوّچی توّ ئینایە ڤێرە؟ گوتێ من پسمامەك بێ هەی . هەتا مەزن دبیت . دێ شوی پی‌کەم . ڤێجا ئەزا ئینایمە ڤێرە . داکو کەس من نەبینیت . هەتا پسمامێ من مەزن ببیت....) .**

**هندی بێژی سترانا کوردی ئەڤ عەدەتە گوتیەو دناڤ پەیڤێت خوّیێت شریندا پاراستیە بوّ نموّنە :**

چوومە (گودبەی) . گولا کەسکر

ڤان پسماما لگەل دوتماما . خەوا خوەشکر

خەلکێ نەزان تەماشەکر[٢٤]

گەروّکێ هێژا . دبلیو . ار . هی . ئەڤ عەدەتە دیتیەو نڤیسیە : (لدیڤ داب‌و نەریتێت عەشیرەتی پسمام فەرترە ژهەمی کەسا . کو دوتمام ببیتە ژنا وی ... [٢٥])لنك عەرەبا ژی دبەرێدا . هەتا نهوّ ژی عەدەتە . کو دوتمامێ بدەنە بسمامی[٢٦] .

١٣ - خوارنا گوشتێ مروّڤا :

خوارنا گوشتێ مرۆڤا . لنك خەلكێ بەرێ هەبویە . ب‌تایبەتی خوارنا گوشتێ بچویكا ....[٢٧]

ئەڤ كارە دچیرۆك‌و چیڤانوكێت كوردیدا هاتیە . بەلێ نەوەكی عەدەتەكێ بەلاڤ . چونكی خوارنا گوشتێ مرۆڤا بتنێ پالدایە (پیرهەڤیێ)و (دێوی)و (كافری) . مرۆڤێت دی نە خواریە و بۆ نمونە دچیڤانوكا (مەستانێ)دا . پیرهەڤی بچویكێ مەستانێ دخوت ... خەلكێ وێ گاڤێ وەسا هزردكر . ب‌خوارنا گوشتێ بچویكی . دێ ژیێ وی درێژ بیت ... دچیڤانوكا (ئەحمەد چەلەبی)دا . كافر هەڤالێت وێ ب‌شیشكێ ڤەدكەت‌و دبژێریت‌و دخوت .... ل‌ئەوربا دا بچویكا كوشن‌و خۆ ب‌خوینا وی دشویشت . یان مەلەڤانی دناڤ خوینا وێدا دكرن . دگوتن ئەڤە دەرمانە بۆ هندەك نەساخیا .....[٢٨]

دچیڤانوكێت كوردیدا خۆ شویشتن بخوینا حەیوانا هەبو .. ئانكو خوینا حەیوانی دەرمان بو . بۆ هندەك نەساخیێت حەكمو سطان . وەكو دچیرۆكا (قولنگیدا) هاتی . كو خوینا قولنگی دەرمانە بۆ نەساخیا حاكمی ...

دچیڤانوكەكا كوردێ هاتیە . كو خوینا (پیرەژنەكێ) دبیتە دەرمان بۆ راكرنا پالەوانێ چیرۆكێ ژمرنێ ... ڤێجا دچن وێ پیرەژنێ تینن‌و سەرێ وێ دبرن‌و رەهێت وێ باش دگڤێشن . وێ خوینێ دلەشێ پالەوانێ چیرۆكێ ددەن . پشتی هێنگێ پالەوان ژمرنێ ساخ دبیت ....

**١٤ – ڤەشارتنا ژن‌و مێرا :**

دچیڤانوكا كوردیدا هاتیە . دەمێ ژنك دمر . مێرێ وێ ژی دگەل دهاڤێتە دوێ زمهریرێدا . یاكو مێرێ وێ دكرە تێدا . خۆ هەكە مێرەك مربایە . دا ژنا وی دگەل هاڤێن ... دگەل زادێ چل رۆژا . وەكو دچیڤانوكا (ئەحمەدو هەر سێ دزا)دا دیار دبیت . دەمێ دبێژیت :

(.....رۆژەكێ ژنكێ ئەمرێ خودێ كر . برایێ وی قەساب گەلەك عێجز بو . بوگری . ئینا ئەحمەد گوتێ . برا نەكە گری . نەڤەچوو . ئەز دێ ئێكا دی ئینم ....

قەسابی گوت . ئەز بۆ ژنكێ ناگریم ... عەدەتێ مەیە . هەكە ژنك مر . مێركی ژی دویڤ‌را دهاڤێن ... مە بیرەكا هەی . ژنكێ دێ هاڤێنە تێدا . مێركی ب‌وەریسا دگەل زادێ چل رۆژا دێ دویڤ‌را بەردەینە خوار ...) .

هەروەسا دەمێ كورێ مختارێ گوندی دمریت دبێژیت :

(... جەنازەك ل‌بەرێت وی كەفت . بەرێ خۆ دایێ . كو ئەڤە كورێ مختاریە . ... دیت ژنا كورێ مختاری ژی دویڤ‌را هاڤێت ... دگەل زادێ چل رۆژا ...) .

ب ژمن‌ڤە ئەڤە نەك هەر عەدەت بویە . بەلكو باوەرەكا كەڤن ژی دگەل هەبە . هەتا سالێت سیها ژی ل(هندێ) . دەمێ مێرێ ژنكەكێ مربایە . دا لەشێ وێ ژی سوژن[٢٩] ...

دوور نینە ئەڤ عەدەتە – ئانكو ڤەشارتنا ژن‌و مێرا پێكڤە – لنك ئاشوریا ژی هەبیت[٣٠]

**١٥ جزائێ قوبحەتەكێ :**

دچیڤانوك‌و چیرۆكێت كوردیدا هاتیە . هەكە ئێكی قوبحەتەك كربایە . دا بەروپشت ل‌كەرەكی سواركەن‌و ل‌ناڤ بازێری ئین‌و بەن . بچویك ژی دا راهێلانێ‌و دانێ ب‌بەرا . وەكو دچیرۆكا (مەلایی)دا . دیاردبیت . دەمێ ل‌كەری سواركری‌و چەند بچویكێت گوندی ب‌دویڤ كەڤتین ...نهۆ كوردا گوتنەك هەیە دبێژیت :

(دێ بەرو پشت . ل‌كەری سواركەم) . ئانكو دێ هەتكا وی بەم . هەروەسا دچیرۆكا (بێ‌ئاقلترین مروڤ)دا . ئەڤ عەدەتە دیاردبیت . بەلێ ب‌رەنگەكێ دی ... دەمێ كورك ماهینا بابێ خۆ دبەت . داكو وەسیەتا وی ب‌جرە بینیت . كو ماهینا وی بدەتە بێ‌ئاقلترین كەس ....

ڤێجا دەمێ كورك دگەهتە بازێرەكی . دبینیت . كو ئێك بەروپشت ل‌كەرەكی سواركریەو خەلكی ب‌بەرو دارا . بێ ب‌دویڤ كەڤتی . پسیار دكەت . كا بۆچی هو ل‌ڤی مروڤی دكەن ؟ !

دبێژنێ ئەڤە حاكمێ مە بێ پارە . ڤێجا هەر سال ئەم ئێكی دانین . ئێكی رادكەین . ئەوێ رادكەین هولێ دكەین ..

كورك دێ چیت ماهینا خۆ دەتە حاكمێ ژنوی دانی . پشتی دبێژتێ . سالەكا دی دێ هول ڤی ژی كەن ؟ دبێژنێ چەوا تۆڤی دبینی . دێ وەل وی ژی كەین ...

خوزی ئەڤ عەدەتە مابایە . داكو قوبحەتكەرو دزیكەر . ئاشكربیان ...

**١٦ خولی سەری :**

دەمێ خەمەكا مەزن بۆ ئێكی چێبیا یە . كورێ وی مربایە . یان ژنا وی . یان مێری وێ ... دا خولیێ ب‌سەرێ خۆ وەركەت . هەرچەندە ئەڤ عەدەتە كێم بویە . بەلێ هێشتا ل‌هندە جها مایە . هەتا نهۆ ژی هەكە ئێكی گوتە ئێكی . (خولی سەر) . دێ عاجزبیت . چونكی هەر وەكو دبێژتێ . بمینی بێ كەس‌و سێوی ...

ئەڤ عەدەتە ب‌پێش چاڤێت گەروكێ هێژا . دیلیو . ای .

ویْگرامو .... برایێ وی كه‌ڤتیه ده‌مێ سه‌ر ل كوردستانێ داین[٣١] .

ژعه‌ده‌تیْت (حه‌به‌شا) ژی بویه . ده‌مێ ئێك ژوان دمر . پرچا خۆ دبری‌و خولی ب‌سه‌رێ خۆ وه‌ردكر .. [٣٢]

**١٧ – شه‌رتێت حاكمی :**

هه‌كه حاكمی هنده‌ك شه‌رت گوتبانه وه‌زیرێ خۆ ئۆ وه‌زیرێ وی ئه‌و شه‌رت نه‌زانیبانه . تێ‌نه‌گه‌هشتباو ئێكێ دی تێ‌گه‌هشتبا . وه‌كو شڤانه‌كی . یان سقافه‌كی ... دا وه‌زیرێ خۆ ئێخیت‌و وی دانته شوینێ .. ئه‌ڤ كاره گه‌له‌ك دسه‌رهاتێت (هارون الرشید) دا دووباره دبیت ...

خه‌لكی رێزو قه‌درگرتن . بۆ ڤان ره‌وشت‌و تیتالا هه‌بویه . هه‌می گاڤا ده‌ستێ وان ل‌سه‌ر سینگێ وان بویه . نمۆنه . دچیڤانۆكا . (ئاقل‌و دونیادار) دا . رێزو قه‌درگرتن بۆ عه‌ده‌تا هاتیه ... چیڤانۆك دبێژیت :

(... بۆچی مه‌كچا حاكمی ل‌ته ماركرو . ته هه‌رۆ سه‌را (نیسوی‌وكانوی) دقوتا ؟

جوتیاری گوت . باشه ما بابێ كچكێ چ مه‌حكه‌ما ب‌من ناكه‌ت ؟ كا سه‌را چی‌یه ؟ كانو و نیسۆ چنه ؟

جه‌لادی گوت . وه‌للا حه‌قێ ته‌یه . رابو چوو گوته حاكمی ...

حاكمی گوت . سه‌را چ ته كچا من دقوتا ؟ كانوو نیسو چنه ؟

جوتیاری گوتێ . كانوو نیسۆ ناڤێت دوو سێهنیكانه . عه‌ده‌تێ مه ئه‌وه . هه‌كه بو ده‌وات . دێ دوو سێهنیكا هینن . كو ژزێری هاتبنه چێكرن . دێ تژی شرینی‌كه‌ن . ئێك بۆ زاڤای‌و ئێك بۆ بویكی . ڤێجا ده‌مێ ئه‌ز بویم زاڤا . من به‌رێ خۆ دایێ . هه‌وه چ سێهنیك نه ئینان . بیرا گوندێ من هاته بیرا من ... ئه‌و سێنی هه‌كه بۆ بویك‌و زاڤا نه‌هێن . چینابیت بویك‌و زاڤا دگه‌ل باخڤن ... حاكمی گوت . تۆ بێ حه‌ق ... ژنویكا بۆ كره ده‌وات‌و .... كچا حاكمی بۆ ژنا وی ...) .

هوسا رێزا ره‌وشت‌و تیتالا دهاته گرتن . خۆ هه‌كه هنده‌ك بێژن . ئه‌ڤه خه‌یالا‌و چ تشتێ وه‌سا نه‌بویه . بتنێ هاتینه گوتن بۆ كوشتنا ده‌می . خه‌لك وه نابێژیت . به‌لكو دبێژن . ئه‌گه‌را مانو نه‌مرنا ڤان چیرۆك‌و چیڤانۆكا دهندێ‌دایه . چونكی گه‌له‌ك سروشت‌و ره‌وشتێت مرۆڤی‌نه‌و بناغه‌یه‌كه راستی ژێ هه‌یه [٣٤] .....

**ژێده‌رو په‌راوێز**

١ – مه‌مێ‌ئالان . چیرۆك نفیس . به‌غدا . ١٩٧٧ . كۆری زانیاری كورد . ل٣٦ . ئه‌ڤ عه‌ده‌ته به‌ری ئیسلامێ لنك عه‌ره‌با ژی نه‌بو . وان ژی ژئیمراتوربه‌تا فارسی‌و رومانی وه‌رگرتبو ... بنێره . لمحات من تاریخ العالم . جواهر لال نهرو . بیروت . ١٩٧٩ . ل٣٠ .

٢ – مله‌تێت خه‌لكی ژی . هه‌ر ب‌كۆمكرنا كه‌له‌پوورێ خۆ دكارن ره‌وشت‌و تیتالێت خۆ بێت كه‌ڤن دیاربكه‌ن . بۆ نمۆنه . هه‌كه چیرۆك (اوزیریس) . نه هاتبا نفیسین . پریا وان عه‌ده‌ت‌و ره‌وشتێت تێدا . د وندا بن ... بنێره . الحكایة الشعبیة . د . عبد الحمید یوسف . به‌غدا . ل٣٨ .

٣ – الاساطیر . د . احمد كمال زكي . مصر . ١٩٧٥ . ل٤٠ .

٤ – القصص الشعبي في السودان . دراسة في فنية الحكایة ووظیفتها . د . عز الدین اسماعیل . به‌غدا . ل٢٣٢ .

٥ – مضمون الاسطورة في الفكر العربي . طبعة ثانیة . بیروت . لبنان . ١٩٨٠ د . خلیل احمد خلیل . ل٧ .

٦ – الاساطیر والخرافات عند العرب . د . محمد المصیدن خان . لبنان . ١٩٨١ . ل١٦ .

٧ – الكتاب المقدس . العهد القدیم . سفر التكوین . لبنان . ١٩٨٦ . ل٤١ .

٨ – الاساطیر . علي الشوك . لندن . ١٩٨٧ . ل١٧٩ .

٩ – الاساطیر والخرافات عند العرب .....

١٠ – داب‌و نه‌ریتی كورده‌كان . نووسینی مه‌لا مه‌حمودێ بایزیدی . د شوكریه رسول . ژرووسی وه‌گێرایه .... ١٩٨٣ . ل٢٢ .

١١ – مع الاكراد . توما بوا . وه‌رگێرانی . اواز زه‌نگه‌نه . به‌غدا . ١٩٧٥ . ل٩٩ .

١٢ – سترانا زارگوتنا كوردایه تاریقێ . ئۆردیخانێ جه‌لیل . شوكور مسته‌فا . ئه‌نوه‌ر قادر ژتیپێت رووسی وه‌رگێراینه سه‌ر تیپێت عه‌ره‌بی . به‌غدا ١٩٧٧ . .....ل٢٨٠ .

١٣ – دلۆك . د . ره‌هبه‌ر رێزان . به‌غدا . ١٩٨٧ . ل٨٦ .

١٤ – الفولكلور في العهد القدیم . جیمس فریزه‌ر . ترجمة د . نبیلة ابراهیم . الجزء الثاني . ل١٧٨ .... هه‌ره‌سا بنێره كتێبا . عقائد ما بعد الموت . ل٢٩٩ ... كا چه‌وا ئاشوری‌و بابلیا پرچا خۆ دبری ....

١٥ – فولكلور ....

١٦ داب‌و نه‌ریتی كورده‌كان .... ل٤٢ .

١٧ – مع الاكراد .... ل٥٢ .

١٨ – داب‌و نه‌ریتی...... ل٣٢ . هه‌روه‌سا بنێره . (الاكراد) . فاسیل نیكتین . ١٩٦٧ . بیروت . ل٩٩ .

١٩ – سیاحه‌تنامه‌ی ئه‌ولیا چه‌له‌بی . وه‌رگێرانی . سعید ناكام . به‌غدا .

# شڤان و سەیێ دەڤ بخوین

زكي سليڤان

هەر رۆژ سپێدێ. دا ژخەو هشیر بت. هێژ تاڤێ نە دایە لات و مێت هنداف گوندی ودا بتە قریە قرێ وی ناف مل و دەست و تنێت خوە د قرچاندن... دەیکا وی یا پۆر سپی کری ل بەر بانێ کولانو خەمە.. ژڤیان دگۆتە کورێ خوە:

– دانێ میرۆ.. تو بۆچی وەدکی..؟

– ئەڤە ریازا منە.. لەشێ من پێ نەرم دبت..

دێ جرەکێ عەردەکێ خوە شکێنی.. بخودێ ئەز پێش تەڤە دترسم..؟ دێ ڤێجا کوت کە. م دێ هەر رۆژ ڤێ ئاخفتنێ بێژی..؟ کا سەحکە ژ دەرڤەی. گوندی کا پەز بەردایە ئان نەء..؟

دەیکات وی چوو ژدەرڤە. ئەوی ژی دەست هاڤێتە تەبەکا ژ لەڤەنا چێکری. ژسەر کوبچکێ سەی ێ سۆریلانك. راکرو دا دەست کتێ...

دەیکا وی هاتە دژوور ڤەو لێ کرە گازی:


١٩٧٩ . لـــ ٢٦٠ _ ٣٠٩ دەمێ فەرمانا تیاریا رابوی . ئێکی جـ ـحەك گوهێت فەلا بۆ ملك غازي برن .....) .

٢٠ – علم الفولكلور . الكزاندر هجرتي گراب . قاهرة . ١٩٦٧ . ت حمة رشدي صالح . ل[٨٢] .

٢١ – الحكاية الخرافية . فردريش فون ديرلاين . ترجمة د . نبيلة ابراهيم . مراجعة د . عز الدين اسماعيل . لبنان . ١٩٧٣ . ل[١٢٩] .

٢٢ – بەیان . ژمارە (١٢٦) سالا ١٩٨٦ ؛ مرنو ڤەژین . انور محمد طاهر...

٢٣ – علم الفولكلور ..... ل[١٣٥] .

٢٤ – ئەڤ حەیرانوکە قوتابی . (صالح ابراهیم حەمێ ژمەرا هنارتبە . وی ژی ژداپیرا خوە وەرگرتیە ...

٢٥ – ستان في كردستان . دبليو ار . هی . ترجمة فؤاد جميل . ١٩٧٤ . ل[٦٥] .

٢٦- الاساطير والخرافات عند العرب .... لعرب ... ل[٧٢] .

٢٧ – الحكاية الخرافية .... ل[١٢٦] . هەرووەسا بنێرە . علم الفولكلور ل[٥٣] کا چەوا چیرۆکا (بولیفیموس) چاکترین نمۆنەیە بۆ خوارنا کوشتێ مرۆڤا ...

٢٨ – علم الفولكلور .... ل[٣٤٨] .

٢٩ – لمحات من تاريخ العالم .... ل[١٣٠] .

٣٠ – عقايد مابعد الموت ... ل[٢٥٤] . ئەولیا چەلەبی . ل بازێرێ ئەخلاتێ . ل سالا (١٠٦٥ك) زمهریرەکێ دبینیت پری لەشێ ژنو مێرا ... سیاحەتنامە . ل[١٦٧] .

٣١ - مهد البشرية . ديلبو . اي . ويگرام . ادگار تی . ای . ويگرام . بەغدا . ١٩٧١ . ل[٢٥٣] .

٣٢ – الفولكلور في العهد القديم .. الجزء الثاني .. ل[١٨٠] .

٣٣ – الفولكلور في العهد القديم ... ل[٥٣٥] .

٣٤ – كبرى الحكايات العالمية . تاليف لويسرا ونتر ماير . ترجمة غانم الدباغ . بەغدا . ١٩٨٦ . ل[٩] .


**تێبینی :**

**هندی چیرۆك و چیڤانۆکێت کوردی ، یێت کو ناڤێت وان لڤرە هاتین . تێکستێت وان لنك منن ، نهۆ دبەرهەڤن بۆ چاپێ ...**

– دەست نەكێ میرۆ... دێ چاوا نانی خوی پاشی..؟ نێ ئێ هەڕمی‌یە..!
– ئەڤە هەڕمی‌یە..؟ دەستێ خوە ب سەری دا ئیناو گوت:
– دێ بینی.. دەمێ مەزن دبت، دێ چاوا بۆ من بتە وج...؟
– ئەرێ‌مالاتە.. دێ هەما تالانا ڤەگێرت. ب سەرێ میرۆیێ خوە كم. ئەو ژی دێ ب بابێ خوەڤە چت..!

تێشتا خوە خوار، دەیكا وی نانو مێویژ بۆ كرنە دچانتەی دا. میرۆ رابیو دەست هاڤێتە كەفا گوپالی.. چانتێ نانی دا ملێ خوەو ئەو سۆر یلانكە ژی، هاڤێتە دبنێ ئێكە دی داو ب ملێ خوە ڤە كرو دەركەت.

ب دلەكێ نازك. بەرێ خوە دا پەزی.. دەمێ ژ ناڤ مالا دەردكەت.. هەچكو بێ وی‌و نەبێ وی‌یە..! لدۆر زڤری. دا بەرەهیا خوەو ژگوندی دویر كەت.

رۆژ هاتە نیڤاو ئەسمانی. لەشێ وی گەرم بی.. بەرامبەری قیبلێ راوەستا، بەرێ خوە دا سیبەرا خوە.. دیت هەما یا لبەر پێت وی.. ئینا گوت: «وەی بابۆ چ زوی بی نیڤرۆ..؟ نوكە بێریڤانا مەنجەلوك هلگرتینە.. لبن دارێت مناسبی ل هیڤیا منن..! ئەز گیرۆ بم دێ نفرینا ل من كن. هندی ئەزمان درێژن.. لبەر پەزی زڤری‌و بەرێ وی دا دارێت مناسبی.

بێریڤانا دەست هاڤێتنە پەزی‌و دۆتن. دبەررا دكەنین‌و ستران دگوتن.. میرۆ ژی كەتە سەر ئەنیشكا خوەو بەرێ خوە دا وی‌دیمەنێ ب رەوش.. ل هەمی رەخا، دەنگێ شالیل‌و كەوو زەرێلا هاتە گوها.. ئەوی ژی دەست هاڤێتە دوودكا ژ لویلاڤێت قولنگا چێكری. ژ پاخلا خوە ئینا دەرو پف كرێ.. كول‌و دەردێن خوە دكرنە ئاوازو ڤەد رەڤاندن.

ئەڤەیە ژیانا میرۆی. شڤانی‌و ژ سپێدێ هەتا ئێڤاری. لبەر تیتۆكا حەتاڤێ شەڤێ ژی. گەلەك جارا لبەر ساهی ستێرا.. دناڤ ئادوییا دا دنڤت. چەند رۆژ ل سالێنە..؟ میرۆ لبەر پەزی بایە.. ئێڤاری یا پەز دهژمارت..! كا چ ژێ نە كێم بی‌یە..؟

گەر ئێكێ پرسیارا حالێ وی كربا..؟ دگوت: «هزار جار من ژ خودێ خوە منەتە.. مادەم پەزێ من تێرەو گوندی ژ شڤانیا من رازینە.. خوەش حالە.

هاڤین ب نیڤی بی. دنیا گەرمە.. سیها دارا گەلەك هوینە.. نیڤرۆیەو میرۆی پێ خوە درێژكری. پێ دخەو چووی.. سەیێ وی ژی ل بنێ پێیا پ... دایە. بەلێ هشیارە.. هەر وەسا پەز ژی مەخەل هاتی‌یە.

دەیكا میرۆی. مێدەكەك پێچای ڤێ‌بی و هاتە هنداڤ سەرێ وی..!.. ئەوی ژی چاڤێت خوە ڤەكرن‌و گوتێ:
– دا... تە خێرە..؟ تو هاتی یەچی..؟
– ئەڤە فراڤینە من یا بۆ تە ئینای..

میرۆی مێدەكا خوە ڤەكر.. مێهڤانكی لبەر ڤەداو دیت.. هندەك برنج و گوشتێ سۆر كری. لگەل دوو نانا. ئینا گوتە دەیكا خوە:
– ئەڤە چ گوشتە..؟ تە ژكیڤە ئینایە..؟

مالا جانگیری، ڤێ‌سپێدی بزنەك سەر ژێكرن.. هندەك بۆ مە ئینـ...
– ما تو لگەل من نا خوی..؟
– هەما بخو. ئەز تێرم.. دوو سێ پاری من لمال خوارن.. سەیێ وی ژی هات.. خوە نێزیك كر. میرۆی پچەك گوشت هاڤێتە بەر.. دیسا كەرێت دەیكا وی ڤەبین وگوتێ:
– ئێ هەی مالا تە خودێ ئاڤا كری.. دێ تو بخوە ما سەی پی‌دڤی‌یە..؟ ئەڤە چ مەژیە دسەرێ تە دا..؟
– گونەهە ویێ‌ل سەر بەختێ مە، ئەز چ بخوم..؟ دێ دمە وی‌ژی.. نێ ژمن پتر شڤانی‌بێ ل ڤ پەزی دكت.
– دایێ گوری. بابێ وی نە چ سەبی.. هێژ ب تێژكینی، بابێ تە خودان كر.. حەتا مەزن بێ. گاڤا دبێ شەڤ.. تو بێژی دەنگێ ژێ بێت، قەد نە درەوی..! دز هاتبانە پەزی..؟ گورگێ كەتبایە ناڤ..؟ نە دچوویێ..!!

ڤێ دویماهیكێ. گورگا هەر هەیڤ.. دوو سێ پەز دخوارن..! بابێ تە ژی بێ چارە بێ هەما چفتە ب ئەنیا وی ڤە پەقاندو كوشت‌و بەلاوی ژخوە ڤەكر. ڤێچا كورێ من.. بخودێ ئەڤە ژی هەر كورێ وی سەبی‌یە..! بۆ خوە تێبگەهە.
– نەدا، نەء... ئەڤە من بێ خودان كری.. ب شیرێ پەزی، نە بێ... دێهلكا.. ! دێ چاوا لمن خاین بت..؟
– دێ بلا كورێ من.. تو مرۆڤەكێ سەر رەق، بلا وەكی تە بت.. بەلێ ژبیر نەكە بێژە رۆژەكێ پیرە دەیكا من هۆ دگوت.

ئەو دەمێ سالێ بوری، پایز ب سەردا هات.. هرو با رابی.. بەلگێت

دارا وەران.. ژنێ پاییزێ ژی تمام بی‌و زڤستانا گەور هات.

سەیێ میرۆی مەزن بی.. ئەڤە کولۆخێ سەرێ وی‌یە.. یێ ناس نەکت. نەوێرت خوە نێزیك بکت.. ناڤ‌و دەنگێ سەی ل‌وان گوندا بەلاڤ بی. گەلەك جارا سەیێت وان گوندێت نێزیك، دکەتنە درێکا وی‌دا.. دڤیان خوە لێ‌بدن..؟ بەلێ دخوەرا نەد دیتن.. ژ کەلواشێ وی‌یێ، وەکی یێ ھرچا دترسان.

رۆژ ئاڤا بی، دەمێ میرۆی پەز ئینایە دگوندی دا.. دەست هاڤێتە گۆپالێ خوەو ل کێشا پەزی راوەستاو هژمارت.. گەهشتە دویماهیێ، ئێکێ کێم کر...؟! دیسا بلەز ژ سەری پێڤە هات.. نەهەرێ..! ئێك کێمە.؟

پەز ل‌ناڤ مالا بەلاڤ بی.. میرۆ راوەستاو هزرێت خوە کرن‌و گوت: «میرۆ.. میرۆ، پەزەك تە کێمە» دەنگەك ژنێ گوندی هاتە گوها. پیرە ژنەکێ گازی دکرو دگوت:

– میرۆ.. وۆ میرۆ، گیسکا من نەهاتی‌یە تە هێلایە ل کیڤە..؟

ئەو ژی خوە نە شارەزا کر، پا بێژت ئەز دزانم..؟ دێ بێژت: وەدیارە تە یا هنگافتی.. ئینا گوت.

– گیسکا چ.. خەمێ..؟ چاوا نە هاتی‌یە..؟

– گیسکا همبز.. ڤێ سپێدێ ژی من یا بەردای..!

– دێ باشە.. باشە، ئەز دێ نوکە ب دویڤ دا چم.

هاتە مال، بلەز چانتە هاڤێت‌و دەرکەت.. دەیکا وی ل ئەیوانکێ شیف بەرهەڤ دکر. ئینا گوت:

– دێ کیڤە چی.. ؟ هو تو دلەزینی..؟

– گیسکا خەمێ نە هاتی‌یە. دێ چم لێ‌گەرم... سەیێ وی ژی ب دویڤ کەت وچوون.

گاڤ ب گاڤ، میرۆی سەحکرە پاوانێ‌گوندی جهێ پەز لێ چەراندی وێ رۆژێ.. گیسکا خەمێ نە دیت.. ! راوەستا. گوهێ خوە دا سەر دەنگا.. ژ دەنگێ دلێ خوە پێڤە هاژ چ دەنگا نەبی.. !

سەر ئەڤراز. بەرێ خوە دا وان لاتێت بلند وگوت: «باوەر ناکم ل‌وان درا بت» چاڤێ وی ڤ ئەسمانی کەت.. ستێرا دگوتە ئێك‌و دوو: «ئەڤە جهێ منە.. تو وێڤە هەرە» و یێ لویر لویرا گورگاو لوان گەلیا دەنگ ڤەدا..! ئینا گوت: « یێ نیڤا شەڤێ.. دا ب زڤرم. دێ نوکە گورگ ب

شولا من ژی ئاخڤن».

گەهشتە مال. دەست ژ پی‌یا درێژتر.. پۆسیدە.. دامای. ئەڤە جارا ئێکێ‌یە. پەزەك وی ئان گیسکەك بەرزە ببت..! هەر دگوت: «چوا گیسك بەرزە بی‌و من هاژێ‌نە» دەیکا وی هات. خوە مەلویل کرو گوت:

-- هادای گوری..؟ تە نە دیت..؟

– نەخێر من نەدیت.. پی‌ ل‌من وەرمین. هندی ئەز لێ‌گەرام... چ پێڤە نەهات..!!

پا ڤێجا..؟

– سوبەهی ب رۆژ. دیسا دێ لێ گەرم.. من دیت باشە.. هەکەر من نەدیت..؟ کا خەمێ چەند پارە بڤێن..؟ ئەز دێ دمێ..

هەیڤ‌و نیڤ نە بورین. روژ بو روژێ کت‌و ماتێت پەزێ گوندی.. یێ میرۆ ل‌بەر شڤان. کێم دبی..! چەند ئێك بەرزە ببایە..؟ میرۆی ئەو چۆنە تێك ڤەددا و چ شینوار ژێ نە ددیتن.

خەلکێ گوندی. هندەك دل‌مای بین‌و گەلەك جارا گازندە ژ سەیێ وی ژی دکرن.. پشتی بەرزە بینا پەزی دەست پی‌کری.

میرۆ هەما دحالێ خوە دا. دکەلی.. دوو سێ جارا خوین ب دەڤێ سەیێ خوەڤە ددیت..!! بەلێ چ خەم ژێ نە هل‌دگرت.. ژ شەرمێت خەلکێ و ژ کەربێت خوەدا. خەو نە دهاتە چاڤا.. شول‌و کارێ وی. دەمێ دبهێن ڤەکرنێ ژی دا بی نوبەگرتن ل پەزی.

ئێڤاری یەکێ وەکی ئێلهوا. چاڤێ میرۆی یێ ل پەزی.. سەیێ وی هەمە ل‌دور پەزی دزڤری‌و دچوو سەرێ ملێ ل‌هنداڤ پەزی رادوەستا!! دوو سێ جارا وەکر.. ئینا میروی گوت: « ئەڤە هەر هوسا نینە.. تشتەك یێ دبن تە ڤە هەی گدیۆ» دا جارێ خوە نەپەنی بکم.. یاباشتر ئەوە ئەز خوە بڤێنم ژ درەو.. کا تو دێ چکی.. ؟ خوە درێژکر. کەپەنە ب سەر سەرێ خوە د کێشا.

سەیێ وی ژ سەرێ ملێ هاتە خوار. ل هنداڤ سەرێ میروی راوەستا.. میرو یێ دبینت، ژ درەو بی خرێنا وی‌و دەنگێ خەوێ ژ خوە ئینا.!

دیسا سە چوو سەرێ ملێ.. سەرێ خوە سەر ئەڤراز کرو وەکی گورگ لویری.. میروی دیت..! ئینا گوت: «ئەڤە چی‌یە..؟ ئەز چ نابینم..؟ چ

ئەڤ بێ ئیفلەحە بوچی هو دکت..؟» هێژ دوان هزرادا.. دەنگێ گورگا ژی هاتە گوها..؟ سەرێ خوە ژبن کەپەنەی ئینا دەرو بەرێ خوەد دتێ.. سێ گورگێ ژڤ رەخیو سێ ژرەخێ دی.. گەهشتنە ئێك..!! و راوەستان، شرك ئاڤ ب لامتورێت وان دە درژت.. سە ژی بەرامبەری وان راوەستایە..! ئینا گوت: « ئەڤ زەرە ژ لێڤا بەرکا من کێم بی.» مویێت نەشێ وی، وەکی کەلەما راوەستان..! ژ ترسا دا، نە وێرت رت خوە بلڤینت. چاڤێت خوە هێلانە دیار.. خوە شرکر.. دیت سەیێ وی، ئەوێ هندە خەلك مەتحەکارێت وی ل بەراهیکێ.. هاتە خوارو کەتە دناڤ پەزی دا.. بەرانەك ژ هەمیا قەلەوتر، دا بەرەهیا خوەو ژ ناڤ پەزی دەرێخست..

پشتی ڤارێ کری، خوە ل حەڤکێ داو ئێخست! چاڤێ هەر شەش گورگا بێ‌لێ..! چاڤێ میرۆی ژی هەر وەسا بێ‌لێ.. پشتی تێر خواری، سە دیسا هلباسکێ ملێ بی.. ڤێجا گورگێ هاتن، کەتنە سەر کەلەخێ بەرانی..! ئینا میرۆی گوت: «ئەڤە تو بخوە دزی..! خەلکێ گوندی گازندە دکرن.. من سەرا تە خوە نەرازی دکر.. پا خودێ کەریمە بۆ من‌و تە. حەتا گورگێ بچن.. تو ژی دزانی نوکە ئەز نە شێم چ بکم».

پشتی گورگا ژی شیڤ خوارین.. ئێك، ئێك بەرێڤەی ملێ بین. سەی ژی خوە بەرزە کر..! میروی کەپەنە هاڤێت، دیت گورگێ نە ماینە ل وێرێ، چوو جهێ بەران لێ کوشتی.. ل دور زڤری. ژ بنێ پێ یا حەتا کولوڤانکا سەری.. ئاخێنکەك هاتێ..! هو چاڤێ وی ڤ سەرێ بەرانی کەت دجهـ دا ناس کر..! دەینا سەرێ خوە ب تەپا وگوت: «پا بخودێ ئەڤە بەرانێ منە..! وەی لا مالا تە میراتو سەووۆ» دلێ وی سوت. هەچکو پەلەك پێ‌ڤەنای، چاڤ لێ سوربین.. ژ خەمێت بەرانی دا.. روندکێت وی رێ نەددا ئێك ودوو و دهاتنە خوار.. ئەو بەرا هەبی. ئەو ژی سەی کوشت.

رابی ژپێرڤە. چاڤێ خوە لسەی گێرا.. لدەڤ کەپەنێ خوە دیت.. جهێ لێ نڤستی. دا بێ‌گومان ببت. ئانکو هاژ تشتەکێ نینە.. نێزیك بی. سەرێ خوە بێ دەینایە سەر دەستێت خوەو... خوە ب سەرڤە لێ نەددا. هێژ لامتورێت وی سورن ژ خوینێ..! میروی ددان لێ چیرکاندنو گوت: «ئەز دشێم نوکە تە ب‌کوژم.. بەلێ بو تە پێچەکە و دلێ من ژی باش هوین نابت.. ئەز دزانم دێ چاوا تە کوژم».

ل رۆژا دی هێژ زوی.. دەست هاڤێتە قەد وەریسەکێ کورت. شڤکەك هنارێ حلوی کرو لگەل خوە برن.. دەمێ چوویە بەر پەزی.

رۆژبلند بی.. ژ برسادا بی قور قورا زکێ میروی.. زانی نێزیکی نیڤرویە، گەهشتە بن خولپەکێ، روینشت‌و چانتێ خوە ڤەکر.. سەیێ وی ژی هاتە رەخ‌و کوریا خوە هەژاند. میرۆی قەد پویتە پێ نەکر..

تێر فراڤین خوار.. سەی ژی ب شراتی یاخوە هندەك خوار. میدەکا خوە پێچا.. دەست هاڤێتە قەد وەریسکی، سە ب قورمێ دارێ ڤە گرێ دا..!!

شڤکا هنارێ هلگرت‌و. ل هنداڤ سەی راوەستا وگوت: «ئەز چ لتە بکم..؟ هەی بێ شەرم، نێ تە دلێ من بێ سوتی،،ناڤێ خودێ ئیناو شڤکا زراڤ ڤەوەشاندە تەنشتا سەی... شڤك ل دویڤ شڤکێ..!! لڤێ تەنشتێ‌و تەنشتا دی، سەرێ وی و هەمی لەشێ وی. چەند شڤکەك ددەینایێ..!؟ خوینێ دگوت: «هەرە ئەڤە ئەز هاتم».

قار قارێت سەی چوونە بەر ئەسمانا..؟! و بزاڤ دکر برەڤت ئان خوە ڤەکت.. چ پێڤە نە دهات.. ! پانێ میروی ب‌دلەك سوتی پێ گرێ دای.

میروی پشتا خوە راست کرو گوت: «قارە قار.. فەیدەی نا گەهینتە تە.. تە بەرانێ من یێ خواری.. ژبەری بەرانی. کاتە چەند خوارینە..؟ گیسکا خەمی..؟ دوو کاڤرێت دی..؟ هەما هندی بەرزە بین.. ئەو تە یێ‌د خوارین..!! ئەز دێ تولا هەمیا ل تە ڤەکم» «بەختێ خودێ کێ دیتی‌یە دەورێ حەفت زەمانا.. سەیێ مروڤ ب‌بتە هەڤالێ گورگا..؟ و بێن هەر پەزێ مروڤ بخوت..؟» هەر یێ ددەینتێ و دبێژت: «من چ ل تەکری‌یە..؟ ژ باشی یێ پێڤە. هەی بێ سوز.. تو برسی..؟ تێر نا خوی..؟ نێ ئەز چ بخوم.. تو ژی هەر وی دخوی».

هند دەینایێ حەتا شڤك کرە پارچە پارچە.. ژ نوی. قەد وەریسك.. ژ ستویێ سەی ڤەکر.. پشتا خوە دا قورمێ دارێ‌و روینشت.. هزرەك برو ئێك ئینا.. ئاخڤتنا دەیکا وی هاتە بیرێ دەمێ دگوتێ «بابێ وی نە چ سە بی.. ئەڤە ژی هەر تێژکێ وی سەیی یە» ژ نوی زانی تێژکێ سەی دێ هەر بتە سە.

# مەت .. شتێ بکە

شانۆنامە

●

نووسینی : عزیز نسین
وەرگێڕانی : سعید یحیی

●



بەشی یەکەم

**ئەکتەرەکان :**

| | |
|---|---|
| مەت : لاوە | کنیاتا : خزمەتکارە |
| نك : باوکی مەتە | گلێز : دەزگیرانی مەتە |
| ری : دایکی مەتە | دکتۆر . . . . . . . |
| شۆ : باپیرەی مەتە | کەسانی دیکەیش |

## پەردەی یەکەم ــ دیمەنی یەکەم

«هۆڵی حەسانەوەی خانوویکی گەورەو فراوانە . لای ڕاستەوە دەرگایەکە دەڕوانێتە شەقام . لای چەپ پلیکانەیەو دەچێتە نهۆمی دووەم . . پلیکانەکە بە تەواوی دیارە . لە نزیك ئەوەوە دەرگای چێشتخانەیە . دەستی لای ڕاستی چێشتخانە پەنجەرەیەکی گەورەیە . لەنێوەڕاستی هۆڵدا سەعاتێکی گەورە بە دیوارەوەیە .

هەر دوو دیواری ڕاستو چەپ لاربوونەوە . بەجۆرێك دەتواندرێ ئەو وێنانەی بە دیوارەوە هەڵواسراون ببیندرێن . بە دیواری لای ڕستی نزیك دەرگا . وێنەی پیاوێکی تەمەن سی‌و پێنج ساڵان هەڵواسراوە دەستی لای ڕاستی سەعاتەکە وێنەی ژەنراڵەو لای چەپی وێنەی پیوێکی ریشدارە . بە دیواری چەپەوەش وێنەی کچۆڵەیەکە . هەر چوار وێنە ڕەنگاوڕەنگن .

هەندێ کورسی ومێز . . چەندستوون ورەفەی کتێب کەچەند کیتبێکیان لەبان دانراون . لە نزیك پلیکانەکەوە ڕادیۆو تەلەفۆنێك لەسەر مێزێکی بەرز داندراوە . لەپێشەوەی شانۆ کورسی‌یەو پێ‌ی زەلامێکی لەژێر دانراوە . لە پێ‌ی پیاوێکی مردوو دەچێ . کە پێ‌ی چەپی بڕیزێ تۆپی پێ‌یەو گۆرەوی تێ‌هەڵکێشراوە . گۆرەوی‌یەکە لەوانەیە کە لەکاتی یاری‌ی‌کردندا بەکار دێ . ڕەنگی دیوارەکان ڕەشە . . کەرەستەو کەلو پەلەکانی دیکە بە ڕەنگی کرایەوە بۆیە کراون . کات شەوێکی بەهارە . بەرە بەرە تارمایی شانۆ دادەگرێ . کە پەردە دەکرێتەوە کەس لەسەر شانۆ

نیه . به دەستی لای ڕاستەوە هەراو هۆریامان گوێ لێیەو تادێ زیاد دەکا . دەنگی مستو دارو شەق وەشاندنو لە دەرگادان .

لەنێو هاتو هاوارەکەدا ئەمە دەبیسترێ :

– هیێی . . هێشتا هەر ماون ؟

– هێشتا زیندوون ؟

– دەمانەوێ بزانین کێ دەمرێ ؟

– کوا ئەو کەسەی دەمرێ ؟

«مەت بە ترسو لەرزەوە لەپلیکانە دادەبەزیو چاوی بڕیوەتە پەنجەرەو شەقام»

«نك لە پێشەوە ری بە دووایەوە لە پلیکانە دادەبەزن . . ری هەردوو دەستی دەخاتە سەر گوێیەکانی . بۆ ئەوەی هەراو هۆریای گوێ لێ‌نەبێ»

مەت : «بۆ سەرەوە دەنگ هەڵدەبڕێ» باوکە . . بابە . . بابە

نك : «بەراکردن» ها . . مەت . . چیە ؟

مەت : هەر وەختە لە دەست هەراو شیرەشیری ئەمانە شێت بم .

ری : «بۆ خەڵکەکەی دەرەوە» ئۆقرەتان نەما ؟ بە دووای دکتۆرمان ناردووە . دەمێکە لە ماڵ دەرچووە . . بێگومان هەر ئێستا دەگا .

«هەراو هۆریاکە دوور دەکەوێتەوە . . مەت لەبان تەختێك ڕادەکشێ . بێ تاقەتو تەمەڵ قاچەکانی دەهەژێنێو بە بێزاری دەدوێ»

ری : ئەم دکتۆرە لەکوێ‌ما ؟ ئەوە چەند ڕۆژە وادە دەداو نایە . . دەی «نك» تەلەفۆنێکی بۆ بکە

نك : «بە توورەیی» لەبەیانی‌یەوە ئەوە چەند تەلەفۆن ! ! ئەی پێش ماوەیەك تەلەفۆنم نەکرد ؟

ری : جارێکی دیکەیش تەلەفۆنی بۆ بکە . . تەماشای ئەم جانەوەرانە . هەفتەیەکی ڕێکە نەیانهێشتووە خەومان لێ‌بکەوێ .

«ئەو کاتەی نك تەلەفۆن دەکا . شۆ لەسەرووی پلیکانەکەوە دادەبەزێ . . کابرایەکی پیرە . کوێرو لاڵو پتە سنووقێکی کارتۆنی بە دەزوویەکەوە بە سنگی یەوە بەستاوە . . سنووقێکی بایەخدارە . . شۆ دەستەکانی درێژ دەکاو ڕێگەیان پێ دەبڕێو لەبان ئەو کورسی‌یە دادەنیشێ‌کە عادەتی پێ‌گرتووە . مێزێکی نزمی بەرامبەرە . سنووق لە مل دەکاتەوەو لەسەر مێزەکەی دادەنێ . بەدەست شوێنەکەی سەح دەکاتەوەو ڕای‌لێ‌نابێ دەیگۆڕێ . . چەند جار ئەم کارە دووبارەو سێ‌بارە دەکاتەوە . لە دەموچاویەوە دیارە نارەزایەو خۆی مەشغوولی سنووقەکە دەکا»

نك : «لە تەلەفۆنەکە» هەلاو نەخۆشخانەیە ؟ من نکم . . خوشکی‌کەی دکتۆر دێ ؟

«گوێ دەگرێ» ئەوەچەند ڕۆژە هەر ئەم قسەیە دەکەی !

ئەگەر هاتبا تا ئێستا هەر دەگەیشت «گوێ دەگرێ» تکات لێ دەکەم پێی بڵێ چاوەڕێی دەکەین . . سپاس . «تەلەفۆن دادەخا» .

ری : «لە تەك مێردی‌یەوە دەوەستێو قسەی لەگەڵ دەکا»ها . . چی‌یان گوت ؟ کەی دەگا ؟

نك : جا من چوزانم ؟

«نك پیاسە دەکا . . ری لە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوە دەکا وەك چاوەڕوانی یەکێك بێ»

مەت : «بنێشت دەجاوێ» من نازانم ئێوە بۆ وا نارەحەتن خۆ دکتۆر ئێوە فەحس ناکا ؟

ری : ئێمە لەبەر تۆ نارەحەتین . . کە چی تۆش نە بای بێ و نە بوران . . گوێت لەو هەللایە نیە ؟ «غەڵبە غەڵب نزیك دەبێتەوە . . دەموچاوێك لە پەنجەرە دەردەکەوێ» .

ئەوانەی دەرەوە : دەزانن کێ دەکوژین ؟

مەت : «پانێ داوەتەوە . . بە گاڵتە»من

نك : «لە خەڵکەکەی دەرەوە دەپارێتەوە» پەلە مەکەن ئێستاکێ تەلەفۆنم بۆ کرد . . ئەوە بەڕێگەوەیە . .

ری : هەر ئێستا دەگاتە جێ

«دەموچاوەکەی پەنجەرە نامێنێ . . دەنگی «کلێر» ی دەزگیرانی مەت لەدەرەوە دەبیسترێ»

کلێر : مەت . . مەت «لە دەرگا دەدا» مەت

مەت : «قاچەکانی دەهەژێنێ» چیت دەوێ ؟

کلێر : ئەوە چ دەکەی ؟

مەت هیچ

کلێر : «نارەحەتە» چۆن هیچ . . دکتۆر بە ڕێگەوەیە ؟

مەت : بابێ . .

کلێر : ئاخر تایبەتی بۆ تۆ دێ . . شتێ بکە مەت

مەت : ئەوە نیە قاچەکانم بادەدەم

کلێر : مەت . . تکات لێ دەکەم شتێ بکە

مەت : ئۆف . . بەس‌بێ . . ئێمە هەموومان پەرۆشی وەزعی تۆین «لاسایی دەنگی ئەوان دەکاتەوە» مەت شتێ بکە . . مەت شتێ بکە . .

نەخێر هیچ ناکەم .
نك : «بۆمەت» با مەحکەمێك بکەن . ئینجا تێدەگەی .
ری : تێدەگا . بەڵام کەی ؟ «بانگی کنیاتا دەکا»
کنیاتا . . کنیاتا . . «کنیاتا لە پلیکانە دادەبەزێ . . گۆرەوییەکی پینەکراوی بە دەستەوەیە . بە درێژایی شانۆنامە گۆرەوی‌و دەرزی‌و داوی بە دەستە . . هەرکە بێ ئیش بێ گۆرەوی پینە دەکا»
کیناتا : «رای لەکارەکەی نابێ . . دووبارە داوەکە هەڵدەوەشێنێتەوە» ری خانم دکتۆر هات ؟
ری : نەخێر نەهاتووە . . قورگم وشت بوو . . شەربەتێکم بۆ نایەنی ؟
نك : منیش شەربەتم دەوێ
مەت : من نامەوێ
کنیاتا : «دەمی لە گوێچکەی شۆنزیك دەکاتەوە هاوار دەکا» جەنابی شۆ . تۆش شەربەتت دەوێ ؟ «شۆ نەکنیاتا دەبینێ‌و نەگوێی لە دەنگی‌یەتی

مەشغولێ سنووقە کارتۆنەکەیە» کنیاتا دەستەکانی وەك بۆری لێ دەکاو بە هەموو هێزو تاقەتی لەبناگوێی شۆ هاوار دەکا» قوربان شەربەتی لیمۆت دەوێ ؟
«شۆ گوێی لە دەنگەکە دەبێ . بەڵام تێناگا . . سەری دەجوولێنێ . نیشانەی ئەوەیە بڵێ : چ دەڵێی ؟ . کنیاتا دووبارە هەو ر دەکا» : شەربەتت دەوێ ؟ «شۆ سەری بادەدا . نیشانەی نەویستنە . کنیاتا لە دەرگای چێشتخانەوە دەچێتە دەرێ»
«جارێکی دیکە غەڵبەغەڵب‌و قەرەباڵغی نزیك دەکەونەوە . . لەو هەراو هۆریایەدا ئەم ووتانە دەبیسترێن
دەنگ ۱ : هێشت دوواتان نەبڕ وە ؟
دەنگ ۲ : ناهێڵین بژی
دەنگ ۳ : هەوڵمەدە . رزگاربوونت نیە
کلێر : «لەدەرەوە لە دەرگە دەدا . مەت . . مەت . .
مەت : «بەرەحەتە . دیسانەکێ چیتان دەوێ ؟
کلێر : گیانی دڵتەنگم
مەت : هێشت دەچوێ تۆ هەروی
کلێر : ئەی تۆ دڵتەنگ نی ؟
مەت : من ر کشەوە . . ئەگەر ر نەدەکشام . رەنگە وەکو تۆ دەبووم . .
کلێر : ئێرەی بۆ نارەحەتە ! ! کراسێکی رەنگ شینم دروست کردووە . دوگمەیەکی و بەیە نابێ . شوێن نەم نەگەڕێم‌و هیچم دەست نەکەوت

. . ئەمە چ دەکەی ؟
مەت : هیچ
کلێر : چۆن هیچ
مەت : هیچ . .
کلێر : دکتۆر بە رێگەوەیە . . مەت شتێ بکە
مەت : ئەوە نیە قاچەکانم دەهەژێنم . . بەس نیە ؟ «قسە بۆ نك دەکا» کلێر کچی چاکە
نك : : دڵێکی پاك‌و بێ گەردی هەیە
مەت : «بە توورەیی» ئەو کەسەی بەمن بڵێ شتێ بکە پیاوی چاکە . . تەنیا من خراپم ؟ !
نك : «دەچێتە لای مەت کە لەبان تەختەکەدا پاڵ کەوتووە» تۆ ناچاری شتێ بکەی . . پێویستە کارێکی وا بکەی بە دڵی دکتۆر بێ . ئەوەی نەش وتا نەکا دەبێ شتێ بکا . . تۆ بۆچی ناتەوێ تێبگەی ؟
ری : مەت . . دکتۆر نایەڵێ بژیت . . رۆژێك چیە ناتداتێ . .
مەت : چەند جار بە ئێوەم گوتووە : من باکم بە دکتۆر نیە . .
«ددان لە پێنەکان دەقرسێنێ» باکم بە دکتۆر نیە . . تێگەیشتن ؟
نك : کەس نیە باکی بە دکتۆر نەبێ . . «دەست بۆ شۆ درێژ دەکا» تەماشای بپیروت بکە . لەم تەمەنەدا ناتوانێ خۆی نیشانی دکتۆر بدا . خۆت دەبینی چۆن کار دەکا .
ری : ب دکتۆر بێ ئینجا دەژی . . یەکسەر مەحکەمەت دەکاو قسەت لێ دەردێنی .
مەت : ب مەحکەمەم بکا . . ئەوەی قسەیە نایکەم «قاچەکانی بادەدا» .
ری : دەتوانی ؟ پێت وایە دەتوانی دەم نەکەیتەوە . . بەڵام ئەوەش بزانە دکتۆر بەزەیی بە هیچ کەس نایەتەوە . . رۆژێك چیە ناتداتێ . .
مەت : هیچم ناوێ
نك : «بە مەلوولی» مەت کوری خۆم چۆن قسەی وا دەکەی ؟
ری : «بەگریانەوە» ئەگەر دکتۆر چەند رۆژێکت نەداتێ نازیت .
مەت : «توورەیە» من نامەوێ بژیم .
«کنیاتا دوو پەرداخ شەربەتی لەبان سنی یەك داناوە یەکێکیان دەداتە «ری» و ئەوەی دیکەش دەداتە «نك» و لەسەر دووا پلیکانەکەدا دادەنیشێ‌و دەست بە گۆرەوی‌پینە کردن دەکا دەدروێ‌و هەڵدەوشێنێتەوە . . تاد»
کلێر : «لەدەرەوەیە» چەند دوگمەیەکم بۆ کراسەکەم دۆزیوەتەوە بەڵام بە دڵم نین . . بە دووای دوگمەی تر گەڕدەخۆمەو لە هیچ شوێن نایاندۆزمەوە

. . مەت گوێت لە منە ؟ «هەراو هۆریای دەرەوە نزیك دەبێتەوە»
کنیاتا : «بەحەشتاوی هەڵدەبەزێتەوە» واهاتن . . ئەی خوایە . .
کلێر : «لەدەرگادەدا» گیانەکەم شتێ بڵێ . . دەڵێم دوگمەی ئاڵم دەست ناکەون «دووا بە دووای ئەمقسەیە . هیچ لە هەراو هۆریای دەرەوە حاڵی نابن ، تەنها ووشەی «مەت» نەبێ . .»
ری : «بە ترسەوە تەماشای پەنجەرە دەکا» ئەم دکتۆرە لە کوێ‌ما ؟ نك جارێکی دیکەیش تەلەفۆنی بۆ بکە . .
نك : «بەتوورەیی بەرەو تەلەفۆن دەچێ‌و چەند ژمارەیەك بادەدا » هەلاو . . نەخۆشخانەیە ؟ من «نك» م «گوێ دەگرێ» تۆ هەر ئەم قسەیە دەکەی ، کەچی تا ئێستاکێ نەگەیشت «گوێ دەگرێ» ئاخر ئەوەندەی نەماوە خانووەکەمان بە سەردا بروخێنن «گوێ دەگرێ» کەی ؟ ئەمە چەند ڕۆژە چاوەڕوانی ئەوێن . . باشە سپاس . «کنیاتاو ڕی لەپشت نك وەستاون‌و گوێ دەگرن . . نك تەلەفۆنەکە دادەخا»
ری : چ دەڵێن ؟
نك : «بە بێزارییەوە» دەڵێن وا دێ
ری : کەی ؟
نك : ماوەیەکە بەرێ کەوتووە
ری : کەواتا دێ . . ئاخ نك . . نابێ بەم شێوەیە بتبینێ برۆ کراسێکی باشتر دەبەرکە . . بە پەلە . جلەکانتم لەبان قەروێلە داناون
«نك دەڕوا . . ری بە دووایەوە» دوو دوگمەی کراسەکەتم لە چەکمەچەی سەرووی کانتۆر داناوە
نك : «لەبان پلیکانە» ئەی تۆ ؟ جل‌و بەرگت ناپۆشی ؟ یا هەر بەم حاڵە دکتۆر دەبینی ؟ «قرەو هەرای دەرەوە نزیك دەکەوێتەوە»
ری : چۆن ناپۆشم ! . . ئەوە هاتم «دەڕوا»
«دەموچاوێك لەپەنجەرەوە دەردەکەوێ»
مەت : «لەشوێن خۆیەوە لەگەڵ دەموچاوەکە دەئاخێوێ . . بە گاڵتە » دەی . . خەریك بن . . «دەنگی بەرز دەکاتەوە تاگوێی لێ‌بێ» دکتۆر هات‌و فەحسی کردم‌و هیچ ماوەی نەدامێ . . گوێی توانای ژیانت نیە . . ئیدی چتان دەوێ ؟ بۆ خۆتان پیاوێك دەکوژن . . چونتان ئارەزووە وای لەناو دەبەن . .
کنیاتا : «بەترەنگاوی . خۆی دەکوتێتە سەر پەنجەرەکە» باوەڕی پێ مەکە . . گاڵتەت لەگەڵ دەکا . . ئێستاکی باوکی تەلەفۆنی بۆ دکتۆر کرد . . وا بەڕێوەیە . . ئا بە لێ بەڕێوەیە . . ئەوە نیە جەنابی نك‌و خاتو ری سەرکەوتن ؟ جل‌و بەرگی نوێ دەپۆشن . . بێگومان دکتۆر دێ . .
«دەموچاوەکە دەکشێتە دوواوەو هەراو هۆریا دوور دەکەوێتەوە»
کنیاتا : مەت ئەوە شێت بووی ؟ ئەمەیش بوو بە گاڵتە ؟ چاوەکانیت نەبینی ؟ دەتگوت دەریای خوێنن . . ئەمە کەی وادەی گاڵتەیە ؟!
مەت : «پێ‌دەکەنێ» ئەی چۆن . . ئەسڵەن ئێستا وادەی گاڵتەو گەپە . . مرۆڤ لەسەر مردن بێ ، لە گاڵتەی خۆشتر دەست دەکەوێ ؟
کنیاتا : «نارەحەتە» بە منداڵی وا نەبووی . . چیت لێ قەوماوە ؟ «بێ‌دەنگ دەبێ» تۆ دەتەوێ بەدایك‌و باوك‌و دەزگیرانت . . بسەلمێنی . . کە چەند کردەوەت بە دزییەوە کردوون . . دیارە گەلێ باوەڕت بە خۆتە . . بەڵام دکتۆر بێ‌و فەحست بکا ، ئەو کاتە هەموو شتت بۆ ڕوون دەبێتەوە . . لەوانەیە دکتۆر بڵێ : بگرە ئەمە پازدە ساڵ . . برۆ پازدە ساڵ بژی . ئەو کاتە هەمووما سەرسام دەبین وانیە ؟ کێ دەزانێ لەوەتەی باڵات نەش‌و نما ناکا ، چەند ئیشوکاری بە کەڵکت کردبێ .
مەت : «لەسەرخۆ ڕاست دەبێتەوە» بنێشتم جاویوە . . باوەشکم هاتوونێ . . پاڵ کەوتوومە . . قاچەکانم باداون . . ئەمانە ئیشوکاری منن «بە گاڵتە» ئەگەر دکتۆر لێی خۆش هات ، ڕەنگە بڵێ : برۆ ئەمە دوو سەدساڵم پێ بەخشی . . ها . . ؟ چ دەڵێی ؟
کنیاتا : گاڵتە بە منیش مەکە . . دکتۆر ماوەی ئەوەت نادا . . تۆ هێشت دکتۆرت نەبینیوە . .
مەت : بۆچی تۆ دیوتە ؟
کنیاتا : نەخێر . . بەڵام کەسانێ هەن بینیویانە . . ئەوەندیان باس‌کردووە تێ لام ئاشنا بووە .
مەت : کنیاتا . . شتێ خۆت نەیبینی باوەڕی پێ‌مەکە .
کنیاتا : ئاخر هەندێکی فەحس کردوون
مەت : تۆی فەحس‌کردووە ؟
کنیاتا : من ؟ کوانێ ئەو ڕۆژە ! «خەریکی گۆرەوی پینەکردنە » ئای ئەگەر دەمزانی ڕۆژی لە ڕۆژان دکتۆر دەمبینێ . .
مەت : چیت‌دەکرد ؟
کنیاتا : ئەی چیم نەدەکرد ؟
مەت : بۆ ؟
کنیاتا : بۆ ئەوەی شتێ بکەم
مەت : «هاتوچۆ دەکا . . دەوەستێ» ئەمە چییە بە دەستەوەیە ؟
کنیاتا : گۆرەوییە پینەی دەکەم
مەت : ئای لەم‌پینەیە . . چەند ڕۆژە ئەم گۆرەوییەت بەدەستەوەیە تەواو

«بەنارەحەتی» بۆ من فەحس بکا ؟ من لە خەڵکی دەرەوەم .. کەهاتمە ئەم ماڵە زۆر بچووك بووم

مەت : ئەی بۆچی ناوەکەت ئەوەندە درێژە ؟ ك .. ن .. یا .. تا .. تەماشای چەند درێژە .. ناوی ئێمە تەنها یەك پارچەیە .

کنیاتا : تۆ پێت وایە ناوم درێژە ؟ «ئاخ هەڵدەکێشێ»

چی بکەم نەداریە ؟ حەشتەبامان نەبوو .. باوکم بە دایکی گوت : هیچمان نیە قیری سیا .. هەر نەبێ کچەکەمان ناوێکی هەبێ . ئەو بوو ناوێکی درێژیان لێنامو هیچیان بۆ نەکردم . مرۆڤ بە ئارەزووی خۆی دەتوانێ ناو هەڵگرێ .. خۆ پارەی تێ ناچێ !

مەت : «بە گاڵتە» ك .. ن .. یا.. تا

کنیاتا : کاتی خۆی ناوم درێژتربوو .. ئەو ناوەی کاتی لە دایك بوون گەلێ درێژتر بوو .

مەت : نا ؟ بۆ ئەو کاتە ناوت چ‌بوو ؟

کنیاتا : کنیاتاسیلاتیکیائیلوٚگا .. تا پازدە ساڵی هەر بەو ناوە بانگیان دەکردم . کە دە ساڵان بووم بە (کنیاتاسیلاتیکیا)یان ناو دەبردم . کە بوومە بیست ساڵان بەشێکی دیکەی ناوم هەڵوەرا . پاشان تەنها «کنیاتا» مایەوە . ئێستاکێ هەمووتان هەر بەو ناوە بانگم دەکەن .

نامەوێ لەمەودووا ناوم کورت بێتەوە . بۆچی بە دەست منە ؟ خوادەزانێ پاش ماوەیەکی دیکە پێم دەڵێن . کینا وانیە ؟ گەورەتریش بم بە «کی»م بانگ دەکەن .. ڕەنگە ئەگەر مردیشم ئەوەی ناوە بۆم نامێنێ .. کەسیش نازانێ کێ مردووە .. ئەگەر کەسێ ناوی نەبێ چوزانن کێیە مردووە ؟!

مەت : باشە نەدەکرا هەر ئەوکاتەی لە دایك‌بووی ناوت بنێن «کی» ؟

کنیاتا : هەویرەکە ئاو هەڵدەگرێ .. وەکو پێم‌گوتی هیچمان نەبوو .. ناوێکی درێژیان پێ بەخشیمو دەیانزانی

پیتەکان هەڵدەوەرێن‌و تەنها یەك پارچەی دەمێنێتەوە ..

مەت : «بەترسەوە» جا ئەگەر ناوت تەواو بوو ؟ هیچچت بۆ نەمایەوە ؟

« بێ دەنگی »

کلێر : «لەدەرەوە » مەت .. مەت .. «بە دەستەکانی لە دەرگا دەدا» مەت دوگمەم پەیداکردن .. بەڵام تەنها دوو کونیان هەن .. من چوارەم گەرەکە .. شوێن نەما نەگەڕێم .. نازانم چ بکەم .. ئەی تۆ چ دەکەی ؟

مەت : هیچ

کلێر : مەت .. شتێ بکە

مەت : «لەبەر خۆیەوە » جا ئەگەر ناوم نەما .. بۆ ناوێکی وا کورتیان داومەتێ ؟ ئەگەر کۆتایی هات ؟ ئەگەر تەواو بوو ؟

کلێر : شتێ بکە مەت

مەت : «بۆ کنیاتا» تۆش ناوت تەواو دەبێ ..

کنیاتا : ئاخر بۆیە گۆرەوی پینە دەکەم .. بۆ ئەوەی ئەگەر مردم بە لایەنی کەم پارچەیەکی ناوم بمێنێتەوە

مەت : ئەی ئەگەر تەواو ؟ «لەگەڵ خۆی» خۆزگە ناوێکی درێژیان دەدامێ ..

« بە هۆی با دەرگایەك دەکرێتەوەو بە توندی چەند جار بەدیوار دەکەوێ»

کنیاتا : منیش دەڕۆم جل‌و بەرگ دەپۆشم .. حەز ناکەم دکتۆر بەم حاڵە بمبینێ ..

« کنیاتا لە دەرگای چێشتخانە دەچێتە دەرەوە .. مەت لەبان تەختە ڕادەکشێ . نك دێتە ژوورەوە .. دەستی جل‌و بەرگی « سمۆکن»ی لەبەر دایە .. مەت نایبینێ ..

کلێر : « لەدەرەوە » ئای کە دڵتە نگ‌و خەفەتبارم ..

مەت : دەزانم .. چونکە دوگمەی کراست پەیدا نابن .

کلێر : تۆ لەمن ناگەی .. لەو ڕۆژی وا تەنگانە یارمەتیم نادەی !

مەت : لەپشت دەرگا یارمەتیت بدەم ؟ وەرە ژوورەوە

کلێر : چۆن بێمە ژوورەوە ؟ ئەگەر بە دەستی من دەبوو نە دەهاتم ؟

مەت : کەواتا هەموو شتێ درۆیە .. ئەگەر بەڕاستی منت خۆش دەویست دەهاتیتە لام .

کلێر : خۆشم دەوێ .. زۆرم خۆش دەوێ .. بەڵام ناتوانم بێم .. ناتوانم بێمە ژوورەوە ..

مەت : ئەگەر حەز بکەی دەتوانی

کلێر : تکات لێ دەکەم .. تێم بگە . ئەگەر دەتزانی لێرەدا چ باسە .. حەوشەی ماڵەکەتان بۆتە ڕۆژی حەشر . هەروەختە دنیا خەراپ بێ .

مەت : ئەگەر حەز بکەی دێی ..

کلێر : ئاخر ئەگەر بێمە ژوورەوە نایەڵن جارێکی دیکە بێمە دەرەوە .. دایك‌و باوکم ڕازی نین .. ناتوانم بێم .. ناتوانم ..

نك : ناتوانی بێ .. کلۆڵە چۆن بێ ؟

« مەت لەدەنگی لەناکاوی باوکی دەترسێ »

کلێر : شتێ بکەمەت .. پێویستە بژی .. بۆ خاتری من بژی .

« ری دێتە ژوورەوە .. کراسێکی سپی دەبەر کردووە .. بە توورەیی لە پلیکانەکان دادەبەزێ»

ری : پێم ناڵێن ئەوە کێ دیواری ئاودەسخانە دەنووسێ ؟

نك : دیواری هۆڵیشیان نووسیوە .

ری : من پاکیان دەکەمەوەو یەکێ دەیاننووسێتەوە .. مەت ئەوە تۆ دەیاننووسی ؟

مەت : نەخێر من نیم .

نك : «شانی دەداتە شانی شۆ ، دەمی لە گوێی نزیك دەکاتەوە» باوکە تۆ هیچت لەسەر دیواری ئاودە سخانە نووسیوە ؟

شۆ : ها ؟

نك : « بەدەنگێکی بەرزتر » ئەمە تۆی دیواری ئاودەسخانە دەنووسی ؟

«شۆ بەسەر ئیشارەتی نەخێر دەکاو خەریکی ئیسشوکاری خۆی دەبێ »

« دەرگای دەستە چەپ دەکرێتەوەو چەند جار بە دیوار دەکەوێ»

مەت : «هەڵدە ستێتە سەر پێ» چەند جارم پێ گوتن ئەم دەرگایە مەکەنەوە .. ئەم سیرەیە شێتم دەکا «لەدەرگای چێشتخانەوە دەچێتە دەرێ»

ری : «هاوار دەکا » کنیاتا .. کنیاتا ..

« کنیاتا دێتە ژوورەوە .. جل و بەرگێکی نوێی پۆشیوە .. هەندێ گوڵی بە قژوشەیکەی سەری نووساندووە .. گۆرەوی پینەکراوی بە دەستەوەیە »

کنیاتا : بەڵێ خانم

ری : « بەدیقەت تەماشای دەکا .. بەگاڵتە» ئای لەم هەموو تەرتیباتە .. دەچیە زەماوەند ؟

کنیاتا : «بەشەرمەوە » ئەی بڕیار نیە دکتۆر بێ ؟

ری : وابزانم دکتۆر بۆ تۆ نایە « بە توندو تیژی » پێویستە هەر کەسەو سنووری خۆی بزانێ !

کنیاتا : « سەری دادەخا » لەدڵی خۆمدا گوتم رەنگە دکتۆر منیش فەحس بکا .

ری : تەماشای !! بۆ تۆ چکارەی ؟

کنیاتا : «بەشەرمەوە» منیش بەقەد خۆم

ری : کێ دیواری نووسیوە ؟

کنیاتا : ئەوەی بەقەڵەمی رەساس نووسراوە ؟ هەندی وێنەش کێشرابوون . خانم من هیچ نازانم .. من پاکیان دەکەمەوە کەچی دووبارە دەنووسرێتەوە .

ری : برۆ بیانکوژێنەوە .. زووکە تا دکتۆر نەهاتووە ..

کنیاتا : بەسەرچاو «دەچێتە دەرەوە»

نك : ئەم ئافرەتە شێت بووە . کێ بیستویەتی کەم و هیچ و پووچێکی وەك ئەوفەحس کرابێ ؟

ری : شتی لە ئێمە گوێ لێ دەبێ ..

نك : «بەنیگرانیەوە» ئەم دکتۆرە کەی دێ ؟ پاشان دەبێ مەت چ بە دکتۆر بڵێ ؟

ری : نازانم .. نك نازانم .. ئەوەی کاروکردەوەیە نایکا .. لە نوستن و پێ درێژکردن بترازێ هیچ ناکا «بێ دەنگ دەبێ» خۆزگە باوکتت تێ دەگەیاند ، با هەندێ رووداوی بۆ بگێرێتەوە بەڵکو حەماس دەیگرێ .. ئەگینا ..

نك : ئەگینا نازێ ..

«مەت دێتە ژوورەوە . ری ئیشارەت دەداتە نك بێ دەنگ بێ .. بەر لەوە کەس ببینێ ، مەت قەڵەمی رەساس دەخاتەوە گیرفانی»

نك : رۆڵە ، دکتۆر بە رێگەوەیە

مەت : دیارە .. ئەوە نیە خۆتان رازاندۆتەوە ؟ !

«پاڵ دەداتەوەو قاچەکانی بادەدا»

نك : تەماشای باپیرەت بکە .. لەم تەمەنەیشیدا وەستانی بۆ نیە .

مەت : باپیرم کەرو نابینایە .. دەمیشی ماندوو بووە ، کەچی حەز لە ژیان دەکا .. بۆ ؟

نك : مەت ئەوە تۆ دەڵێی چی ؟

ری : ئای خوایە .. چیم گوێ لێ بوو ؟

مەت : بۆ خۆتان سەخڵەت دەکەن ؟ دیارە لەمەبەست و مەرامی من نەگەیشتن .. گوتم باپیرەم کەروکوێرو خڵەفاوە کەچی گەرەکیەتی بژی ..

نك : خۆ ماشاڵڵا چاوەکانی تۆ بێ غەشن

ری : گوێ بەکانیشت ساغن ..

نك : کەدکتۆر هات ، پرسیارمان لێ دەکا : باڵای کورەکەتان بەرز دەبێ ؟ ئێمەش وەڵامی دەدەینەوەو دەڵێین :

نەخێر .. ئەوکاتە روو لەتۆ دەکاو دەڵێ : مەت وەرە پێش .. چیت کردووە بۆ ئەوەی بژیت ؟ ! چی وەڵام دەدیتەوە ؟ .

مەت : چی وەڵام بدەمەوە ؟ دەڵێم جەنابی دکتۆر بەندە ئەوەی کار بێ نەمکردووە .

ری : دکتۆر بەمە رازی نابێ .. پێویستە کارێکت ببینێ ..

مەت : ئەوە نیە قاچەکانم دەهەژێنم

نك : جانەمەکەی کارە ؟

مەت : کار نیە هیچ ..

نك : ئاخر نازیت .. دکتۆر ماوەت بۆ نابڕێتەوە ..

مەت : نازیم ؟ مالازم !

ری : «بەگریانەوە» ئۆف لە دەس ئەم کورە .. خۆ لەهیچ ناگا .. کوری

خۆم دەمری .. دەمری ..
ـەت : «دەست بۆ دەرگای سەر شەقام درێژ دەکا» ئەی ئەوان چۆن
ـەژین ؟ ها ؟ ئەوانەی دەرەوە چۆن دەژین ؟
ـرێ : «توورەیە» کێ ؟ ئەوانەی دەرەوە ؟ ئەو حەشاماتە ؟
ـپیس و چەپەڵ و کەمانە ؟
ـەت : پیس ـ چەپەڵ ـ هەرچی هەبن .. چۆن دەژین ؟
ـت : ژیانی چی ؟ کەسیان ناژی ..
ـرێ : نەخێر .. کەسیان ناژی .. یەکێ مانای ژیان نەزانێ چۆن دەژی ؟
ـت : مرۆڤ ئەگەر مانای ژیان نەزانێ ـ بەزیندوو دەژمێردرێ ؟
ـەت : کەواتا منیش ناژیم
ـرێ : پێویستە تۆ بژی
ـەت : «پێیەکانی دەهەژێنی» ئەوە نیە دەژیم ..
ـشۆ سنووقەکەی لەدەست دەکەوێتە خوارەمە .. خۆی لار دەکاتەوەو بە
ـخۆی تەلەکە دەست دەکوتێ و سنووق هەڵدەگرێتەوە مەشغوولی کارەکەی
ـخۆی دەبێتەوە»
ـت : «لە شۆ نزیك دەبێتەوەو لە بناگوێی هاوار دەکا» باوکە .. باوکە ..
ـدەستی دەخاتە سەر شانی» باوکە ..
ـشۆ : چیت دەوی ؟
ـت : «بە دەنگی بەرز لەگەڵ باوکی دە ئاخێوێ» «مەت» مان بۆ حاڵی ناکەی
ـێ ناگا ژیان زەروورو پێویستە .
ـدکتۆریش لەسەر هاتنە ..
ـرێ : «لە گوێیەکەی تربەوە» دەتوانی تێی بگەیێنی ـ تۆ چۆن ئەم تەمەنە
ـدرێژت بردووتە سەر .؟
ـشۆ : «لە کاتی شەرحکردندا تەنگاو دەبێ .. هەڵدەستێتە سەرپێ ..
ـلەکۆتایی قسەکانی جحێڵ دێتە بەر چاو» ئەمە خۆم ..
ماوەی ژیانی سەدو هەشتا سالم وەرگرتووە ..
ـەت : «فیتە دەکێشێ .. سەدو هەشتا ساڵی پێ زۆرە» کەچی هێشتا هەر
ـدەبەوێ بژی .
ـشۆ : زیاتریش دەژیم .. بە ئاسانی سەدو هەشتا ساڵم پێ نابرێ ..
ـکەسانێك دەناسم دووای فەحس و تاقیکردنەوە دووسەد ساڵیان دراوەتێ .
ـێ دەنگ دەبێ» باشم وەبیرە ، کە یەکەم جار دکتۆرم بینی تەمەنم بیست و
ـك ساڵان بوو «دەستی بۆ پەنجەرە درێژ دەکا» پەنجەرەکەلەم لایەبە ..
ـانیە ؟ .. بەڵێ دکتۆر هات و لەبەر دەم ئەم پەنجەرەدا وەستاو منیشی
ـهێش خۆی وەستاند ..

«شۆ دەچێتە بەر دەم خەیاڵی دکتۆر» وا هەست بەو کاتە دەکەم . دەڵێی
ئەمرۆیە .. بە دەستێکی ئاوو نانو بەدەستی دیکەیەوە پیاڵەی ژەهر ..
پێی گوتم : جەنابی شۆ .. باڵاکەت چیتر کەلەگەت نابێ .. وایە ؟ «لە
کاتی قسەکردندا ـ شانۆ بەرە بەرە تاریك دەبێ .. شۆ لەژێر یتشکی
رووناکی دایە و بەترس و لەرزەوە وەزعەکەشەرح دەکا» گوتم : بەڵێ
حەنابی دکتۆر وایە .. گوتی : ئامادەی بۆ تاقیکردنەوە ؟ گوتم : ئامادەم ..
هەستم دەکرد دەنکم دەرناچێ .. گوتی : چیت کردووە بۆ ژیان ؟ گوتم :
قوربان مەسەلەیەکی بیرکاریم ساغ کردووتەوە : دوو کۆ دوو دەکەنە چوار .
دکتۆر پێکەنی «لەتاریکی یەوە دەنگی دکتۆرمان گوێ لێیە» شۆ بەرەو
تاریکی دەدوێ ـ وەك دکتۆر لە بەرامبەری راوەستا بێ»
دەنگی دکتۆر : «بەپێکەنینەوە» زۆر باشە .. کارێکی گرنگت کردووە .
پیرۆزباییت لێ دەکەم . بەلام بەداخەوە باوکت و باپیرە گەورەت و
هەموویان دەزانن دوو کۆ دوو دەکاتە چوار . ئەمە پیش دۆزینەوەی تۆ
سەلمێندراوە .. هیچی دیکەت کردووە ؟ شتێکی نوێ بابەت ..
بەکەڵك .. شتێکی چوان ؟
شۆ : «بەترس و لەرزەوە» نەخێر هیچی ترم نەکردووە ..
د . دکتۆر : بەداخەوە .. دەقیقەیەك چیە ناتدەمێ ..
شۆ : ئاخر ..
د . دکتۆر : خۆت ماندوو مەکە .. بێ سوودە مەپارێوە ..
شۆ : جەنابی دکتۆر .
د . دکتۆر : من گوێم لەپارانەوە نابێ .. ناڵەو دادو فیغان بێ سوودن ..
تەواو ئیتر ناژی .
شۆ : بەم لاو بەو لا دادێ و دەست لە هەوا دەکوتێ .. هەوڵ دەدا خۆی
بە شتێ بکرێتەوە ، تەماشای سەرەوە دەکاو ئەژنۆ دەداتەوە» جەنابی دکتۆر
روحمم پێ بکە ..
دکتۆر : تۆ خۆت روحم بە خۆت بکە . هیچم لە دەست نایێ .. بمبوورە
دەبێ بمری
شۆ : «هاوار دەکا» دەمەوی بژیم دەمەوێ بژیم ..
د . دکتۆر : کەس نیە ژیانی نەوێ .. هەندێ کەس ژیانی دەوێ و لە
کاروبارەکەی گەیشتووە . هەندیکێش مانای ژیان نازانن «بەتوورەیی»
جەنابی شۆ کردەوەت چی یە ؟ ناتوانم مافی کەسانی ترت بدەمێ و لەسەر
چسابی ئەوان بژی .. دەبێ بمری .
شۆ : «وردە وردە هەڵدەستێتەوە سەر پێ ، دەست بو لای دەنگەکە درێژ
دەکا» دووا مۆڵەت و فرسەتم بدەرێ .. جا بزانە چۆن مافی ژیانم دەبێ ! !

دكتۆر : دووا فرسەتت دەدەمێ .. برۆئەمە بیستو چوار سەعات مۆڵەت .. ئەمەیش نانو ئەمەیش دۆڵکەی ئاوو پیاڵەی ژەهر . بیستو چوار سەعاتی دیکە مەحاکەمە دەکرێیتەوە یا مافی ژیانت دەبێ .. یا .
شانۆ رووناك دەبێتەوە .. شۆ هەڵساوەتە سەر پێ .. ئەوانی تر بە ترسەوە تەمەشای دەکەن»

شۆ : «بەدەستی بە دووای مەت گڕ دەخوا» مەت .. مەت .. ئەوە تۆ لە کوێی ؟ «مەت دەدۆزێتەوە .. دەستی بەسەریا دێنێ» مەت گوێ بگرە .. دەبوایە لە ماوەی ئەو بیستو چوار سەعاتەدا شتێ بکەم .. یانیش ژەهرەکە بنۆشم ..

مەت : «بە حەشتاوی» نەکەی باپیرە .. نەکەی ..

شۆ : ژەهریش نەنۆشم هەر دادم نادا «دەنگەکانی دەرەوە بەرزو نزیك دەبنەوە .. شۆ بەرەو هەراو هۆریا هەنگاو دەنێ» مەترسیی هەرە گەورە

ئەوانەی دەرەوەن .. تا ئەمرۆکە کەس لەچنگیان رزگاری نەبوو . یا دەبێ ژەهر بنۆشی . یا ئەمانە پارچە پارچەت دەکەن .

مەت : «بە دەنگی بەرز . نزیك گوێی شۆ» ئەی ئەگەر رابکەی؟ رابکە باپیرە رابکە ..

شۆ : بۆ کوێ؟ ناتوانی رابکەی .. کەس نەیتوانیوە رابکا .. کەس نەیتوانیوە بچێتە دەرەوە .

نیاتا : «لەناکاو دەرگا دەکاتەوەو دێتە ژوورێ بە ترسو لەرزەوە هاوار دەکا» خانم .. خانم ری .. هەمووی ساتە وەختێك نابێ دیوارەکانم پاك کردنەوە . کەچی جارێکی دیکە دیوارەکان نووسراونەتەوە .. ئەمجارە وێنەیشیان لەگەڵە .. گومانی تێدا نیە یەکێ لەم خانووەدا خۆی شاردووەتەوە» بێ دەنگی» .

نك : «بۆمەت» تۆ نووسیوتە؟

مت : نەخێر

ری : ئەی کێ دەنووسێ

مەت : بۆچی لەمن زیاتر کەس لەم ماڵەدا نیە ؟

ری : «بۆکنیاتا» زووکە برۆ پاکیان بکەرەوە ..

کنیاتا : لەوە ناچی پاك بێتەوە

ری : دیوار هەڵکەنە .. دەتەوێ دکتۆر ئەم پیسیو چلکنییە ببینێ؟ فرچەی ئاسن بە کار بێنە .. «کنیاتا دەچێتە دەرەوە» .

مەت : «دەمی لەگوێی شۆ نزیك دەکاتەوە» باپیرە پاشان چ روویدا؟

شۆ : بیستو چوارسەعات مۆڵەت درابووم .. سەعاتیش وەستانی بۆ نەبوو «دەنگی سەعات بەرزدەبێتەوە .. هەرکە شۆ قسە دەکا . دەنگی سەعات کز دەبێتەوە» .. دۆڵکەی ئاوو نانو پیاڵەی ژەهرم وەرگرت چوومە دەرەوە ..

چاوەڕێی کۆتایی ماوەکەم دەکرد . حەشاماتە رەشەکەی دەرەوە ناوم بیەن . دایكو باوکم دەگریانو دەپارانەوەو دەیانگوت : شۆ : رۆ گیان شتێ بکە . هەر نەبێ هەفتەیەك بژی .

مەت : ئای ئەگەر شتێکیان بۆ دەکردی ؟

شۆ : هەر کەسەو شت بۆ خۆی دەکا .. ئەمە ژیانە .. کەس توان شتکردنی بۆ غەیرە نیە .. ئەگەر باوکەو ئەگەر دایکە .. ئەوانیش رۆژ خۆیان هەیە ..

نك : ئەوە شتێکیان بۆکرد .. خۆ دکتۆر پێی دەزانێ .. ئەوکاتە دەڵێ ئەمە تۆ نەتکردووە .. دەسکردی تۆ نیە .

شۆ : لە زەمانی ئێمەدا . بە هۆی عارەبانەوە ئاویان دەهێناو تادەگەیشت ماوەی دوو رۆژی دەخایاند بێ ئاوی خەڵکەکەی قڕو تەشەنە کردبوو . منیش ئەوکاتە پیاسەم بە نێو شاخو دۆڵەکانی دەوروبەری ئاوایی دەکرد .. لەناکاو کانی ئاوێکم دۆزیەوە .. ئاوەکە هەڵدەقوڵی و پاشان لەنێو دەنک زیخو چەودا وون دەبوو .

نیشانەیەکم لەسەری داناو بە پەلە هاتمە ماڵەوە .. ئەو دەمە تەن دووسەعاتو چەند دەقیقەیەکم مابوون .. کردمە هەرا :

ئاوم دۆزیەوە .. ئاو .. دەتوانم بژیم ! دکتۆر گوتی :

.. «پیرۆزبایت لێ دەکەم .. لەسەر ئەم دۆزینەوەت مانگێکی دیکە دەژی .گوتم : ئاخۆ لە خۆشیدا دەژیم ؟ دکتۆر گوتی :

.. وەکو خۆشیی ئاوەکە دەژی .. لەکەیفان دۆڵکەو پیاڵەم فڕەدانو شکان

«کپیو بێ دەنگی» پاشان چەند جارێکی دیکە مەحاکەمە کرام .. جاری دووەم هەشت ساڵم وەرگرتو تێکرا کردی سەدو هەشتا ساڵ .

نك : دووا مەحاکەمەی من بەر لە پێنج ساڵ بوو .

ری : من هێشتا سێ ساڵم ماوە ..

«شۆ دادەنیشێ .. خەریکە سنووق لە بان مێزەکە دادەنێ .. زەنگی تەلەفۆن لێدەدا .. ریو نك بە جووتە بەرەو تەلەفۆن رادەکەن .. مەت خۆی تێك نادا»

نك : لە تەلەفۆنەوە» بەڵێ من «نك»م .. دێ؟ دەمێکە دەرچووە؟ «بێ دەنگ دەبێ» زۆر سپاست دەکەم «تەلەفۆن دادەخا ری دەگرێتە باوەش بە رێگەوەیە .. وا هات «ری و نك دیقەتی مەت دەدەن» مەت گوێت لێ نەبوو؟ دکتۆر بە رێگەوەیە .

مەت : جا ئەوە هات؟

ت : ئاخر بۆ تۆ دێ!
ی : مەت شتێ بکە
ەت : «بنێشت دەجاوێ» بۆ؟ چ دەقەومێ؟
لك : رۆڵە گیان ئەوەندە ئازاری باوکت مەدە .
ی : دەبێ بژی .. پێویستە بژی ..
«مەت گوێی ناداتێ‌و شانی دەهەژێنێ»
نك : مەت
مەت : «لە ری‌و نك نزیك دەبێتەوە» ئێوە ناتانەوێ من بژیم!!
نك: ئەم قسەیە چیە؟
ری : ئەگەر بە دەست من دەبوو .. تەواوی رۆژەکانی خۆم دەدایە تۆ ..
مەت : کێ هەڵدەخەڵەتێنی .. من یاخۆت؟ ئێوە دەزانن من هیچم نەکردووە .. کەواتا بۆچی ئاگاداری دکتۆر دەکەن‌و تکای لێ دەکەن بێ؟
ری : دکتۆر لە خۆیەوە دێ ..
مەت : باشە بۆ پەلەی لێدەکەن؟ کە زانیتان بە رێگەوەیە کەیفتان سازبوو .. ئاخۆ ئێوە خۆشحاڵن بە وەی تا ئەبەد ئیدی من نابیننەوە؟!
ری : «بەگریانەوە» نەخێر رۆڵە .. نەخێر وا نیە ..
نك : «نارەحەتە» تۆش رۆژێ لە رۆژان دەبیتە باوك‌و منداڵت دەبن .. تۆش مەحاکەمەی منداڵەکانت دەبینی ..
ری : ئەمە خۆشترین کاتی دایك وباوکە
مەت : ئەی ئەگەر بزانن منداڵەکەیان ناژی ؟ «بێ دەنگی» دەی وەڵامم بدەنەوە !!
نك : ئەم مەحاکەمەیە بۆ دووا رۆژی تۆ پێویستە .. وەك خۆشیی من‌و باوکتە کاتێ لە دایك بووی .. یا وەك ئەو کاتەیە کە منداڵ یەکەم جار دەچێتە قوتابخانە .. جا بزانە دایك‌و باوکی چەند شادمان دەبن .
ری : وەك ئەو رۆژە وایە کە فێری قسە بووی .. یا ئەو رۆژەی ددانی یەکەمت دەرچوو ..
مەت : «قسەکانی دەبڕێ» مانای ئەوەیە . ئێوە دەتانەوێ زوو بمرم .
ری : ئاخر ...
نك : ئەمە دووا مەحاکەمەیە
ری : رەنگە ...
نك : تەنها یەك هیوامان هەیە ..
مەت : هاوار دەکا» نەخێر «لەبان تەختەکە پاڵ دەکەوێ»
کلێر : «لە دەرەوە» مەت «لە دەرگا دەدا» مەت .. دوگمەی چوار کونم دۆزیەوە بەڵام بازنەیی نین .. دوگمەی شەش پەڕم دەوێن .. زۆریش گەرام دەستم نەکەوت .. مەت ئەوە تۆ خەریکی چی؟
مەت : هیچ
کلێر : مەت شتێ بکە ..
مەت : لەمە زیاتر؟ ئەوە نیە قاچەکانم دەهەژێنم ..
«هەراو هۆریای دەرەوە لە هەموو جارەکانی پێشوو .. بەهێزو نزیکتر دەبێتەوە .. کنیاتا دێتە ژوورەوە»
کنیاتا : دکتۆر هات .. وا هات .. دکتۆر هات ..
«هەموویان دەترسن تەنها شۆ نەبێ . کە گوێی لەهیچ نیە»
کلێر : «بە مست لەدەرگا دەدا» دکتۆر هات .. دکتۆر هات .. «بێ دەنگی»
ری : وا هات ..
نك . «سەری لە بناگوێی شۆ نزیك دەکاتەوە» باوکە واهات
«شۆ لە ئیشوکارەکەی واز دێنێ‌و هەڵدەستێتە سەر پێ .. بە ترس‌و لەرزەوە لە یەکتر نزیك دەکەونەوە .. هەموویان تێکرا تەماشای دەرگاری دەرەوە دەکەن کە دکتۆری لێ بێتە ژوورێ .. دەنگی پێ نزیك دەبێتەوە .. ئەو کاتە دکتۆر لە سەرووی پلیکانەوە بەبێ دەنگ دادەبەزێ .. چاویلکەی لەچاوە .. دەموچاوی بە پێکەنینە .. جانتایەکی بە دەستەوەیەو کراسێکی سپی خستووتە سەر باسکی .. تەمەنی لە دەوروبەری چل – پەنجا ساڵان دایە .. کەس هەست بەهاتنی ناکا»
مەت : ئاوڕ لە پلیکانەکان دەداتەوە . کە دەبینێ هاوار دەکا» دکتۆر ..
ری : «پەشۆکاوە» وای دکتۆر ..
«لە ژێر باری ترس‌و لەرزەوە زیاتر لە یەکتر نزیك دەبنەوە .. وەك پەیکەر لەشوێن خۆیان دەچەقن .. دکتور بە زەردەخەنە تەماشایان دەکا» .

* * *

## دیمەنی دووەم

«هەموو شتێ وەك خۆیەتی . دیمەنی یەکەم نەگۆڕاوە تەنها دیوارەکان نەبن زیاتر رەش هەڵگەڕاون .. ئەکتەرەکان لە هەمان شوێنی خۆیانن کە لە کۆتایی دیمەنی یەکەمدا وەستابوون .. بێ ئەوەی دەسکاری دیکۆر بکرێ .. دەتوانداری شانۆنامە بەردەوام بێ»
دکتۆر: «بەپێکەنینەوە دوو هەنگاو دەنێ» ئەم کاتەتان باش .. چاوەڕوانی

منتان دەکرد .. وا نیە ؟ فەرموون ئەوە هاتم «شۆو نلـ‌و ری‌و کنیاتا ، کە گۆیان لە قسەکانی دکتۆر دەبێ ، بلاوەی لێدەکەن .. دکتۆر جانتاکەی لە شوێنی دادەنێ»

نلـ : «بۆ لای دکتۆر دەچی» دکتۆرگیان بەخێربێی .. «دەست بۆ دەرگای دەرەو درێژ دەکا» وامان دەزانی لەوێوە دێی ، بۆیە «تەوقە دەکەن»

دکتۆر : لەبەر ئەوە پەشۆکاون؟

ری : دەمێکە چاوەروانین .. «تەوقەی لەگەڵ دەکا»

دکتۆر «دەستی مەت دەگرێ‌و دەستێکی دەخاتە سەر شانی» چۆنی مەت؟ «مەت وەلام ناداتەوە» ئەمەتا لە کاتی خوێندا هاتم «تەوقە لەگەڵ کنیاتا دەکا، کە بەتەك پلیکانەکانەوە واق ورماو وەستاوە» چۆنی کنیاتا خان؟

کنیاتا : «بەشەرمەوە» سپاست دەکەوم جەنابی دکتۆر .. ماشەللا ناویشم دەزانی .. کەچی ئەمە یەکەم جارە بە خزمەتتان دەگەم .

دکتۆر : «بە پەلە خۆی دەگەیێنێتە شۆ ، کە بەرامبەر سنووقەکەی وەستاوە .. دەیگرێتە باوەش» شۆی مەزن «بە دەنگی بەرز» چۆنی کەڵە پیاو ؟

شۆ : «بەهەڵچوون» ئەمە دەنگی دکتۆرە «بە دەموچاوی بە پێکەنین» دکتۆری بەرێز ..

دکتۆر : بەڵێ .. خۆیەتی .. برادەرەکەتە

شۆ : یاخوا بەخێر بێی ..

دکتۆر : بیست‌و سێ ساڵە یەکترمان نەبینیوە

شۆ : «گوێی لی نابێ» بەڵێ؟

دکتۆر : «هاوار دەکا» بیست‌و سێ ساڵە

شۆ : هەر دەڵێی دوێنێیە

دکتۆر : «بە دەنگی بەرز ـ لە نزیك گوێی شۆ» یەکەم مەحاکەمەی خۆت وە بیرە؟

شۆ : پێش ماوەیەکی کەم باسی ئەوەم بۆ دەکردن .. ئەو کاتە تەمەنم بیست‌و یەك ساڵ بوو «ئاخ هەڵدەکێشێ .. دادەنیشێ‌و خۆی بە سنووقی کارتۆن مەشغوڵ دەکا»

دکتۆر : خاتو ری .. مەحاکەمەی تۆ ..

ری : سێ ساڵی ماوە ..

دکتۆر : نەخێر ـ ساڵێك‌و هەشت مانگ‌و هەفتەیەك‌و چوار سەعات ماوە ..

نلـ : من زیاترم ماوە

دکتۆر : تۆش چوار ساڵ‌و سێزدە رۆژو دوو سەعاتت ماوە «دادەنیشن .. کنیاتا دەچێتە دەرەوە .. مەت لە پشتیان وەستاوەو گوێ دەداتە قسەکانیان .. ترسی لێ بەدی دەکرێ»

نلـ : ئەوە دکتۆر گیان چۆن لەبیرت ناچی؟

دکتۆر : من لەبیرم ناچێ .. بەلام ئێوە چۆن لەبیرتان دەچێ؟ «بێ دەنگی» دەزانن لەکوێ دێمەوە؟ بەر لەوەی بیمە ئێرە مەحاکەمەی کەنناسێك‌و زانستمەندێکم کرد ..

ری : «بە سەری لووتی» فەرمووت کەنناس؟

دکتۆر : بەڵێ کەنناس

ری : لەکەیەوە ئەو بۆرە پیاوانە فەحسن دەکرێن؟

دکتۆر : یەکێ ئارەزووی ژیانی هەبێ .. ناچارم مەحاکەمەی بکەم .. خاتو ری .. بەر لەوانیش مامۆستایەکم مەحاکەمە کرد .

نلـ : چەند ساڵ ژیانی وەرگرت؟

دکتۆر : هیچی وەرنەگرت «دکتۆر بۆیان باس دەکاو ئەوانیش گوێ دەگرن» کابرا مرد !. (زیس)ی ناو بوو خۆزگە دەتانبینی .. دەموچاوێکی گەش‌و پر لەخەندە .. پرسیارم لێکردو گوتم : مامۆستا جەنابت چیت کردووە شایانی ژیان بی؟ کابرا وەکو پێویست بێ ئەرکی خۆی بەجێ گەیاندبوو .. قوتابیانی فێرکردووەو رۆژێك چیە لەو ئەرکەی دووانەکەوتووە .

ری : کەواتا بۆ مرد؟

دکتۆر : خانم‌گیان .. شتێکی نوێی دروست نەکردبوو .. هەر وەك خۆی ماوەتەوە .. تەنها دەزانی لەسەرپێیان بوەستێ .. جا وەستان قازانجی چیە؟ هەڵویستێکی باشە بەلام هەر ئەوەندە بەس نیە .. فرسەتێکی بیست‌و چوار سەعاتم دایێ .. کەچی هیچی نەکرد .. ئاوی دۆلکەی نۆشی‌و خۆراکی خوارد ..

نلـ : ئەی ژەهر ؟

دکتۆر : ترسا .. ژەهرەکەی نەنۆشی .. سەعات سێی سەر لە بەیانی کۆمەڵێ رەش‌و رووت پارچە پارچەیان کرد .. قوربەسەر .. ئای کە پیاوێکی مەزن بوو !

مەت : «ئاوری لێ دەداتەوە» ئەی بۆ هێشتت بمرێ؟

دکتۆر : «سەر بۆ لای مەت وەردەگێرێ» جا مەنی بەرێز من چم لەدەست دێ ؟ خۆی هەوڵێکی نەدا «بێ دەنگی» کابرای زانستمە ندیش سەعاتێکی دروست کردووە لەگەڵ سەعاتەکانی دیکە جیاوازە .. بۆ هەر مرۆڤێك کاتێکی تایبەتی بەگوێرەی بیرکردنەوەی داناوە .. هەندێك سەعاتەکانیان بەخێرایی کار دەکەن‌و هەندێك لەسەرخۆ . هەندێکیش هەن کە ئەسڵەن سەعاتەکانیان کارناکەن ..

نك : جادەژی ؟
دکتۆر : ئەی چۆن ؟ سەدو پەنجاساڵ دەژی ..دووای ئەو رووم کردە کابرای کەنناس .. ئەویش مانگێکی‌و وەرگرت ..
ری : ئەو چی‌کردووە ؟
دکتۆر : شێوەیەکی نوێی لەخاوێن کردنەوەی شەقام دۆزیتەوە .. لەجیاتی بەسە عاتێك خاوێن بکرێتەوە ، تەنها پازدە دەقیقە دەخایێنێ .. کە مانگێك تەواوبوو ، جارێکی دیکەیش فەحس دەکرێتەوە .. خۆ ئەگەر شتێك بکا ، رەنگە زیاتریش بژی ..
«کنیاتا بە سێ شەربەتەوە دێتە ژوورێ .. هەر یەکەو پەرداخێکی دەداتێ»
دکتۆر : کنیاتا ، تۆش خۆت فەحس دەکەی ؟
کنیاتا : «لەخۆشی‌یان دەپەشۆکێ‌و سێ‌یەکەی لە دەست دەکەوێتە خوارێ» منیش فەحس دەکەی ؟
دکتۆر : قەی‌چی دەکا .. بۆ پەشۆکای ؟
ری : «بەگاڵتەو فیزەوە» هیچی‌کردووە شایانی فەحس کردن بێ ؟
کنیاتا : «بە شەرمەوە» لەوانەیە .. خانم رەنگە شتێکم کردبێ «لە شادمانی نازانی چ بکا» منیش فەحس بکرێم !!
کلێر : «لە دەرەوە» مەت .. مەت «بەهەموو هێزو توانای لە دەرگا دەدا» مەت ..
نك : «بە دکتۆر دەڵێ» ئەوە کچی دراوسێمانە ..ماڵیان بە تەك ماڵی ئێمەوەیە ..
ری : دەزگیرانی مەتە .. کچێکی گەلە نازدارە ..
کلێر : «لە دەرەوە» مەت .. لێرەی .. شتێ بڵێ ..
دوگمەی شەش پەرم پەیدا کردوون ، بەڵام زۆر وردن بۆ کراسەکەی من دەست نادەن .
مەت : «لەدەرگاکە نزیك دەبێتەوە» کلێر .. دەمت داخە .. بەسیەتی دکتۆر لە ژوورەوەیە «دکتۆر هەڵدەستێتە سەر پێ .. (ری‌و نك)یش هەڵدەستنەوە .. دکتۆر دیقەتی تابلۆکانی دیوار دەداو باسیان دەکا»
دکتۆر : «لەبەر دەم تابلۆی دەستەڕاست»یە .. وەکو خۆی ماوەو نەگۆڕاوە .. هەر دەڵێی ئەو رۆژەیە کە درایە بەر گوللە .. کەس وەکو ئەو نەژیاوە .. مافی ژیانی بە خوێن وەرگرت ..
نك : چوار سەد ساڵ ؟
دکتۆر : نەخێر چوار سەدو پەنجا ساڵ دەژی .. بە حجێڵی مرد .. «لەبەر دەم تابلۆی ژەنراڵ دەوەستێ» جەنابی ژەنراڵ «کیش» ڕێزێکی بێ پایانمان بۆت هەیە .. تەماشای-سەربازێکە بۆ خۆی .. سەرتاپای چەکە ..
سەرووی لەهی خواروو جیا نەدەبۆوە .. بە هیچ شتێ پێ نەدەکەنی ..
ری : دەڵێن شەرکەری باش بوو ..
نك : باش جەنگاوە ..
دکتۆر : باشیش بیری دەکردەوە .
نك : وابزانم دوو سەدساڵ ..
دکتۆر : بەڵێ‌دوو سەدساڵ دەژی «لەبەر دەم وێنەی خاوەن ڕیش‌دا .. هە.. منداڵێکی تووکن‌و ڕیشدارە .. ماوەیەکی ئەواو دووای مردنی ژیا ..
نك : زەمانێك لەبیرکرا ..
دکتۆر : ئەوەی شتێك بۆ ژیان بکا لەبیر ناکرێ ..
ری : ڕاستە
دکتۆر : پێنج سەدو هەشتا ساڵ ژیانی‌بەتی «دێتە بەرامبەر وێنەی دەستە چەپ .. هی کچێکی ناشیرینە» ڤینای کلۆڵ ..
ری : بۆ کلۆڵە ؟ لەبەر ئەوەی هەر تەنها مانگێك ژیا ؟
کنیاتا : خۆزگە من مانگێك دەژیام .. «دکتۆر لە پێشەوەی شانۆ تێپەڕ دەبێ .. ساتمە لە پێی یاریزانی تۆپی‌پێ دەکا»
دکتۆر : مردووەك لەژێر ئەم کەنەپەدا هەیە .. یەکێ لێرەدا مردووە ..
نك : «بە ساردوسڕی» مردوو نیە دکتۆر ..
ری : ئەمە پەیکەری کوڕەکەمانە ..
نك : کوڕە گەورەکەمان .. براگەورەی مەت ..
دکتۆر : ئەوەی یاری دەکرد ؟ دەمناسی .. وەرزشکاربوو ..
مەت : «بەلەخۆبایی» یاریزانی هێرش‌بردن بوو
نك: ئەمە پەیکەریەتی «قاچەکە لە گەچ دروست کراوە ..نك هەڵیدەگرێتەوە .. گۆرەوی‌یەکی رەنگاو رەنگ‌و پێڵاوێکی لەگەڵ قاچەکە لە باوەش دەگرێ» ئەمە پەیکەری کوری گەورەمانە ..
ری : «بە دکتۆر دەڵێ» پەیکەرەکەت بە دڵە ؟
دکتۆر : «بەسەر سوڕمانەوە» ئاخر ئەمە تەنها پێی چەپە ..
نك : خۆت دەزانی پێی چەپە .. گرنگترین شوێنی لەشی کوڕەکەمان بوو
مەت : کە شەق لەتۆپ دەدا ، یا تۆپەکە دەدڕێنێ یا تۆڕەکە ..
ری : پەیکەرێکی جوانە .. هەر لەخۆی دەکا
نك : ڕۆژی هەینی ئاهەنگی بۆ ساز دەکرێ ..« پێ‌یەکە بەدیوار هەڵدەواسێ‌و بەرامبەری دەوەستێ‌و بەدیقەت تەماشای دەکا»
نك : هەر هەمان پێ‌یە .. وانیە ؟
دکتۆر : خۆیەتی .. «دۆڵکە ئاوێك‌و کولێرەیەك‌و پەرداخێك لە جانتاکەی

دەردێنێ » هیوادارم پێویستمان بە مانە نەبێ « بە هۆی با ، دەرگای ناوەوە دەکرێتەوەو بە چوار چێوەی دەکەوێ »
مەت : « بەتوورەیی بەکنیاتا دەڵێ » دیسانەکێ دەرگای .« دەچێتە دەرەوە ، بۆ ئەوەی دەرگاکە داخا »
نك : «کەمەت دە چێتە دەرەوە ، بە دکتۆر دەڵێ » بە هیچ جۆرێك نەمانتوانی پێی بسەلمێنین ..
ری : هەوڵێکی زۆرمان لەگەڵ دا .. بەڵام نەمانتوانی بروای پێ بێنین کە ژیان خۆشە ..
نك : زۆرمان هەوڵدا ..
ری : تۆ نازانی چەند کاری تێ کردووین ! ! هەر ئەم تاقە کورەمان هەیە
نك : کورەکەی دیکەمان ..
دکتۆر : « بەزەردەخەنەوە » وا دەکەن منیش بگریم .. نازانم چتان لەمن دەوێ ؟ مەتێك بۆ خۆی هیچ ئەکا ، چۆن یارمەتی ی بدەم ؟ وا نیە خاتو ری ؟ ئەرکی من بەزەیی پێ هاتنەوە نیە ، بەڵکو لێپرسینەوەیە .
ری : دەزانم جەنابی دکتۆر .. باش دەزانم .. بەڵام بۆ دایکێکی وەکو من ئاسان نیە .
نك : تاقە کورەکەمان .. لەبەر چاوماندا بمرێ !
دکتۆر : کەسێ نەتوانێ ژیانی خۆی دابین بکا ، لە مردن ناخۆشتر نیە ؟ ئێوە خۆتان دەزانن جێگە دەست ناکەوێ .. یەکێ شتێ نەکا شوێنی نامێنێ ..
نك : بەڵێ راستت فەرموو ..
دکتۆر : مرۆڤێکە نرخی ژیان نازانێ .. بەراستی جێگەی داخە پاشان ئێوە بۆ نیگەرانن .. خۆ هێشتا مەحاکەمم نەکردووە ؟
کنیاتا : «بۆ ری » : خواردن ئامادە بکەم ؟
ری : ئامادەی بکە .. «کنیاتا لە دەرگای چێشتخانەوە دەچێتە دەرێ »
دکتۆر : وا دیارە شۆ گەرەکیەتی هەزار ساڵ تەمەنی بێ .. ئەمە چ تاقەتێکە ؟!
نك : هەر وا بووە
ری : دەقیقەیەك چیە وەستانی بۆ نیە .. « مەت دێتە ژوورەوە . بێ ئەوەی کەس پێی بزانێ قەڵەمەکەی دەخاتەوە گیرفانی .. لەسەر کورسی یەك دادەنیشێ »
نك : چەند ساڵەباوکم ئەمە حاڵیەتی ..

دکتۆر : باشە چ دەکا ؟
نك : نازانین
دکتۆر : پرسیارتان لێنەکردووە؟
نك : هیچ شت بەکەس ناڵێ ..
ری : جارە نەبێ دەڵێ : پیاوی بەتەمەندا چوو . منداڵە .. منیش مناڵم و ئەمەش بووکۆکەی منە ..
کنیاتا : « لە ناکاو دەرگا دەکاتەوەو دەڵێ » ئای خوایە .
ری : « بەترسەوە » چەتیو چ رووی داوە ؟
کنیاتا : وەرە تەماشاکە .. دیواری چێشتخانە هەمووی هەر نووسین و وێنەیە .
ری : دیسان ؟ ری و نك دەچنە دەرەوەو دێنەوە .. مەت و دکتۆر ناجووڵێنەوە » .
نك : ئەمە چیە ؟ نازانم
کنیاتا : ئەوەندە نابێ هەمووم رەش کردنەوە
دکتۆر : مەسەلە چیە ؟
نك : حەشتە بای تێناگەین . ماوەیەکە بە قەڵەم دیوارەکانی چێشتخانە دەنووسرێن ..
کنیاتا : وێنەیش دەکێشرێن ..
ری : دەڵێی جنۆکە لەمماڵەدا هەیە
دکتۆر : «ئاور لە مەت دەداتەوە » دیوار نووسین ؟ «بێ دەنگی .. کنیاتا دەچێتە دەرەوە » نك .. قەت سەرنەکەوتویتە بان بورجەکە ؟
نك : بورجی گۆرەپانەکە دەفەرمووی ؟ ئا بەڵێ .. سەرکەوتووم .. ناوە ناوە بەیەکەوە لەگەڵ خانمی ژنم دەچینە ئەوێ ..
ری : لەو بەرزاییەوە دیمەنی شار گەلێ دڵگیرە .. خەڵکەکە زۆر ورد دیارن ..
نك : پیاو ناوێرێ تەماشای خوارەوە بکا .
دکتۆر : دیقەتی رووی ژوورەوەی بورجتان داوە ؟
نك : کەم ..
دکتۆر : وێنەو نووسینیان لەسەر نەکرابوون ..
ری : ئەی چۆن ؟ بستێك چیە دیواریان نەهێشتووە .. ئای کە نووسینی سەیر سەیرن .. ئای کە وێنەی بێ مانان ..
زۆربەیان ناخوێندرێنەوە .. هەباو بیرو ران ..
ری : کەسانێك وێنەی خۆشەویستەکانیان هەڵکەندووە ..
دکتۆر : ئەو کەسەی بیەوێ بچێتە مێژووی ئەدەبەوە .. شیعر نووسی و وێنە

ەسەر رووی دیواری شوێنەوارەکان هەڵناکەنێ .. بەڵام هەر کەسەو بە نی کردەوەو چوستو چالاکی خۆی دەیەوێ بژی «تەماشای مەت دەکا» هەندێك هەن دەزانن ژیان پێویستە .. کەسانێکیش بەمە نازانن .. لەم مەی ئێوەدا یەکێك هەیە بەمە نازانێ .. ئارەزووی ژیانی هەیە ، بەڵام خۆشی نازانێ چی دەوێ ..

کنیتا : «دێتە ژوورەوە» سفرەو خوان ئامادەیە ..

ری : دکتۆر گیان فەرموو «دکتۆر بازووی شۆ دەگرێو یارمەتی هەستانەوەی دەدا»

ت : جەنابی دکتۆر ، باوکم هیچ ناخوا

ری : شیرو شەربەتو میوە نەبێ .. «دکتۆر و ری و نك و کنیاتا دەچنە دەرەوە»

کنێر : «لە دەرەوە» مەت .. مەت ..

مەت : کلێر چت دەوێ؟! بەڕاستی دوگمەکانی تۆ بێزاریان کردووم ..

کنێر : ئەوە چ دەکەی ؟

مەت : هیچ

کنێر : چۆنە هیچ .. قاچەکانت ناهەژێنی ؟

مەت : نەخێر .. ئەم دکتۆرە زەوقو میزاجی تێکداوم .. لەوەتەی هاتووە قچەکانم ناهەژێنم ..

کنێر : شتێ بکە مەت .. شتێ بکە ..

مەت : بە تەنها هیچم بۆ ناکرێ .. نایەیتە ئێرە ؟

کنێر : چۆن بێم ؟ ئەمانەی ئێرە ناهێڵن بێمە لاتان نەیادا بەکێکتان بکا !! دەڕۆمە دووای دوگمەکانی خوم «دەنگی دوور دەکەوێتەوە» بە هیوای دیدارێکی دیکە ...

ری : «لە بلیکانەوە دادەبەزێ» وەرە نانت بخۆ ..

مەت : «داماوە» برسی نیم .

ری : ئەگەر نانیش نەخۆی ، وەرە لەگەڵمان دانیشە .. لە حزووری دکتور دا ئەمەناکرێ «بی دەنگی» دیسانەکێ داتەلاملی؟! دەی کوری خۆم وەرە .

مەت : «هاوار دەکا» دەڵێم برسی نیم .

ری : هەڵس و کەوتت لەهی پیاوان ناکا «دەڕوا مەت وەستاوە دیقەتی شۆ دەدا .. چەند جار بە دەوروبەری دەسوورێتەوە .. لێی نزیك دەبێتەوە»

مەت : لە بناگوێی شۆ ، بە دەنگی بەرز» باپیرە ..

شۆ : «لەسەرخۆ» مەت ئەمە تۆی ؟

مەت : بۆ رازی ئەم سنووقە بەکەس ناڵێی؟ ها؟

شۆ : هش .. «بەیەواشی» کەس لێرە نیە؟

مەت : نەخێر کەسی لێ نیە

شۆ : هەر منو تۆین ؟ ئەوانیتر لەکوێن ؟

مەت : نان دەخۆن

شۆ : «دەستەکانی لە روومەتی مەت دەکوتێ» بە تۆی دەڵێم .. شت لەتۆ ناشارمەوە .. ئەم سنووقە نێوی «سنووقی تاریکی»یە . خەریکم تەواوی تاریکی ئەم دنیایەی تێبکەم .. تەماشا .. تەنها کونێکی هەیە .. وا دەکەم لەم کونەوە تاریکی بچێتە ژوورەوەو زیندانی بکەم ..

مەت : «بەدەنگی نزم کەشۆگوێی لێبنەبێ» گێلی نەفام

شۆ : تاریکی دەگرمو دەیخەمە نێو ئەم سنووقە .. بەردەوام خەریکم کەچی لە دەستم ڕادەکا .. ئای ئەگەر دەمگرت !! تێدەگەی دەڵێم چی وانیە؟ پێویستە تاریکی حەپس بکرێ بۆ ئەوەی خراپە لەگەڵ رووناکی نەکا ..

مەت : «بە دەنگی بەرز» جا ئەمە کەڵکی چییە؟ بۆچی باشە؟

شۆ : «لەم پرسیارە سەرسام دەبێ» بۆچی باشە ؟! ئادەمیزاد لە تاریکی رزگاری دەبێ .. تەنها رووناکی رووی زەمین دەپۆشێ ..

مەت : پیری ئاخر شەڕ .. «بە دەنگی بەرز» ئەی بۆچی ئەمە بەخەڵك ناڵێی؟

شۆ : بۆ ناڵێم؟ «بێ دەنگی» تا بڵێن شێت بووە؟ ئەوکاتە دەیدرکێنم کە تاریکم خستە نێو سنووق .. با لە تاریکی رزگاریان بکەم ئینجا دەزانن .. تۆ تێم دەگەی وا نیە؟ .. ئەوکاتە کەس ناڵێ شێت بووە .. دنیاو ایە «دەست بۆ وێنەی دەستەڕاست درێژ دەکا» بۆ نموونە .. ئەمەتا «بێرب» هەوەڵ گوتیان شێتە .. پاشان ڕاستی دەرکەوت .. گرنگ ئەوەیە راستی دەرکەوێ ..

مەت : نەگبەتە .. تێك چووە «بە دەنگی بەرز» ئەم کارە چ سوودێکی توی هەیە؟

شۆ : «بەسەر سامی دەست بۆ دەرەوە درێژ دەکا» ئەوانەی دەرەوە رزگاریان دەبێ .. با تاریکی بگرم .. دەرەوە رووناك دەبێتەوە .. رووناکی بۆ هەمووان .. خەڵك لە تاریکی دەترسن .. بۆ؟ چونکە نە هیچ دەبینن و نە هیچ دەزانن . کەواتا ئێمە نەك هەر لە تاریکی دەترسین بگرە لە نەزانیش ترۆقاوین .. تۆ بیری لێبکەرەوە .. مەت .. ئەگەر رووناکی هەموو شوێنی گرتەوە ، ئەوەی ترسە نامێنێ ..

مەت : «بە دەنگی بەرز» خۆت لە ژوورەوەی .. چۆن ئەو هەموو تاریکییە دەخەیتە ئەم سنووقە .. بۆ ناچیتە دەرەوە؟

شۆ : «بەترسەوە» بچمە دەرەوە؟ بۆکی تا ئێستا چۆتە دەرەوە تا من بچم؟
ئەوانەی دەرەوە هەر چیان وەگیر بکەوێ لەناوی دەبەن .
مەت : تیّیان بگەیێنە کە لە تاریکی رزگاریان دەکەی
شۆ : ئاخر خۆیان هەست بە تاریکی ناکەن .. هیچی لیّ نافامن ..
ئەوەی بلیّ ئێوە لە تاریکی‌دان ، دەبنە دوژمنی باوە کوشتەی .
مەت : تۆش واز بێنە .. بە هەر کەسەر بە ئارەزووی خۆی بژی چ
کاریکت بەسەر ئەم خەلّکەوە هەیە ؟
شۆ : ئەوانەی دەرەوە بەختەوەرن  هیچی لیّ تیّ ناگەن .. تۆ بۆچی
وەزعیان تێك دەدەی ؟
شۆ : ئەوکاتەی رزگاربوون تێدەگەن ..
مەت : ئەگەر لەناویان نەژی .. چۆن رزگار دەبن؟ .
شۆ : بەم سنووقە .. کە تاریکیم خستە ناو سنووق ئەو کاتە دەیسووتێنم‌و
هەرچی تاریکییە دەسووتیّ .. «وردە وردە شانۆ تاریك دادیّ .. کنیاتاو
دکتۆر دەکەونە ژێر تیشك .. مێزێکیان لەنێواندایە ، دۆلکەو کولێرە نان‌و
پەرداخی لە بانە»
دکتۆر : فەرموو کنیاتاخان .. دەتەویّ بژی وانیە؟
کنیاتا : وایە قوربان .. دەمەویّ بژیم .. زۆریش بژیم ..
دکتۆر : وەکو هەموو کەس ..
کنیاتا : مەت نەبیّ .. ئەو ژیانی ناویّ .
دکتۆر : ئەویش حەز بە ژیان دەکا .. بەلاّم پێی نازانیّ .. هەستی پیّ ناکا
.. ئەگەر ژیانی نەویّ بۆ دەرو دیوار دەنووسیّ؟
کنیاتا : «سەر سامە» بە راستە؟! بۆ مەت ئەو ووشە نارێك‌و نەگونجاوانە
لەسەر دیواری ئاودەسخانە دەنووسیّ؟
دکتۆر : خۆیەتی .. هێشتا بۆی ساغ نەکراوەتەوە «کش‌و ماتی» تۆ خواردن
دەخۆی کنیاتاخان وانیە؟
کنیاتا : خواردن؟ ئابەلیّ ..
دکتۆر : ئاویش دەنووشی؟
کنیاتا : بەلیّ
دکتۆر : چ خواردنێکت لاخۆشە؟
کنیاتا : فاسۆلیای ووشك
دکتۆر : زۆرحەزت لێیەتی؟
کنیاتا : زۆر .. مردووی فاسۆلیام .. بەتایبەت ئەگەر بیبەری سووری
بکرێتە سەر ..
دکتۆر : بۆ؟

کنیاتا : هەروا
دکتۆر : ئاخر بۆحەزی لێدەکەی؟
کنیاتا : نازانیّ چ بلیّ» نازانم .. قەت بیرم لیّ نەکردووتەوە ..بەلاّم حە
لە فاسۆلیای ووشکە ..
دکتۆر : کنیاتاخان! تۆ تیکە بۆ ژیان دەجاوی .. ئاو بۆ ژیان دەنۆشی
بەلاّم هەرگیز بیرناکەیتەوە بۆ تیکە دەجاویو بۆ دەنۆشی .. تۆ بۆیە حەز
لەفاسۆلیایە چونکە حەزت لەژیانە .. تۆ لەبنیاتی ژیان دوور دەکەویتەو
رادەکەی .. «بیّ دەنگی» کنیاتاخان!
کنیاتا : بەلیّ
دکتۆر : شووت نەکردووە .. وانیە؟
کنیاتا : بەلیّ وایە .. شووم نەکردووە
دکتۆر : بەلاّم دلّدار بووی ..
کنیاتا : «بەشەرمەوە» تەنها یەك پیاوم خۆش ویستووە .. دەیگوت «گی
دەگریّ» .
دکتۆر : بلّی .. بلّیّ .. شەرم مەکە .
کنیاتا : شیعری بۆ دەخوێندمەوە .. کە یاریی بەقژم دەکرد پیّم وابوو . د
لە لێدان دەوەستیّ ..
دکتۆر : بەردەوامبە ..
کنیاتا : کە دەستی دەگرتم . هەستم بە خۆشی دەکرد
دکتۆر : بۆ؟
کنیاتا : خۆشم دەویست ..
دکتۆر : بۆ؟
کنیاتا : خۆشم دەویست‌و بەس
دکتۆر : کنیاتا خان .. تۆ بۆیە خۆشت دەویست تا کو نەمری .. تەماش
چاوەکانت دەکرد تانەمری .. بەهەر نگایەك .. نەهەر جوولەیەك
دەژیای .. منداڵتان ببوایە . هەر بۆ ئەوەبوو تەمەنتان درێژتر بیّ .
کنیاتا : من ئافرەتێکی خۆپەرست نیم .. کە تەماشای چاوەکانیم دەکر
بیرم لەوشتانە نەدەکردەوە ..
دکتۆر : ئەویش بیری لیّ نەکردووتەوە .. ئەمە مەت .. دیوار دەنووس
وێنە دەکێشیو ناشزانیّ بۆچی وا دەکا .. ئەمە دووەمین ئەندازەی ژیانە
رووەکەی تریەتی .. کنیاتا تۆ دەترسی؟
کنیاتا : لەچی؟ . لە مردن؟ گەلیّ دەترسم .
دکتۆر : کەوابوو خۆت بە شتیّ بگرەوە .. هەر شتیّ بیّ .. بۆ ئەوەی
مردن رزگاربی ..

کنیاتا : خۆم بە هێزی چاکە گرتووە
دکتۆر : دەنا گۆشتت دەتوێنەوە .. دەترسی؟
کنیاتا : زۆر دەترسم
دکتۆر : خۆت بەشتێ بگرە ..
کنیاتا : دەستەکانی خۆشەویستەکەم ، دەنگی ، قژی ، نگاگانی ..
دکتۆر : تەمەنت درێژ دەبێ .. ئێستایش دەترسی؟
کنیاتا : زۆر دەترسم .. زۆر
دکتۆر : خۆت بەشتێ هەڵواسە .. شتێ لەباوەش بگرە .. دووای ئەوەی رۆح و گۆشتت دەتوێنەوە .. کنیاتا خان تۆ بۆ ژیان چیت کردووە ؟
کنیاتا : «گورەوییەکانی دەستی بۆ درێژ دەکا» ئەمە توانای منە .. ئایا .. دەتوانم بژیم؟
دکتۆر : «گۆرەوییەکە وەردەگرێ» ئەمە گۆرەوییە؟
کنیاتا : من تاکەکەسم وای پینە دەکەم .. ئەوەی ئاسەواری پێوەی دیار نیە

دکتۆر : تۆ کەوتیتە قۆناغی سێیەمی ژیان .. کنیاتا خان
کنیاتا : «لە خۆشیا دەگری» زیاتر دەژیم ..
دکتۆر: شتێکی تریش بکە .. شتێکی نوێ .. شتێکی زل .. «شانۆ وردە وردە تاریك دەبێ .. دەنگی مەت بەترسەوە بەرز دەبێتەوە» دایە «شانۆ رووناك دەبێ . دکتۆرو ری ونك دووای ژەمەکەیان دەخۆن لە پلیکانەوە دادەبەزن و بە کەیفەوە قسە دەکەن .. پاشان کنیاتا دادەبەزێ و بە دەرگای چێشتخانە دەچێتە دەرەوە .. شۆ هێشتا هەر خەریکی سنووقەکەیەتی .. بەترسەوە سەیریان دەکا»
کلێر : «لەدەرەوە» مەت «لە دەرگا دەدا» مەت لێرەی؟
دکتۆر : بۆ ئەم کیژۆڵە دەنگ خۆشە بانگی ئێرە ناکەن؟
ری : نایە
نك : ئەوانەی دەرەوە ناهێڵن بێ ..
دکتۆر : با تاقی بکەینەوە ..
کلێر : «لەدەرەوە» لە هیچ شوێنێدا نەمدۆزیەوە !
دکتۆر : کلێرخان ، بە دووای دوگمە گر دەخۆی؟
کلێر : بەڵێ
دکتۆر : مەت دوگمەی لایە .. بەڵام نازانن ئایا لەوانەن کە تۆ پێویستیت پێ هەن یانا؟!
مەت : «بۆ دکتۆر» دوگمەی چی؟ کەی من دوگمەم لایە؟
دکتۆر : «بۆمەت و کلێر» دوگمەکانی مەت دوو کونەن .. بە کەڵکت دێن؟

کلێر : من خۆم بە دووای دوگمەی وام ..
دکتۆر : ئەوانەی لای مەت هەڵاشن ..
کلێر : «بە دەنگی پڕ لە شادی» منیش ئەمەم دەوێ ..
دکتۆر : ئەوانەی لای مەت شەش پەڕەن
کلێر : «بە خۆشییەوە» خۆیەتی .. ئەم جۆرەم گەرەکە
دکتۆر : چاکە .. وەرە وەریان بگرە
: «هەراو هۆریای دەرەو زیاتر دەبێ وئەم دەنگانە دەبیسترێن»
: کلێر نەرۆی
: کلێر جارێکی تر ناتوانی بێیتە دەرەوە
: ئەمانە لە خشتەت دەبەن ، مەڕۆ ژووری ..
: کلێر مەڕۆ دەئکوژن . «لە ناکاو دەرگای دەستەراست دەکرێتەوەو کلێر بە کەیفی سازو دڵی خۆش دێتە ژوورەوەو یەکسەر دەچێتە لای مەت »
کلێر : «بۆمەت » ئەوە بۆ هەوەڵ جار نەتگوت دوگمەم لایە ؟
مەت : «بە تووڕەیي کلێر لە خۆ دوور دەکاتەوە » دوگمەم لاینە .. درۆیە .. هیچم پێ نیە
کلێر «بە رڵی شکاو » هەڵتخەڵەتاندم ؟ گاڵتەت پێ کردم ؟ درۆت لە گەڵ کردم ؟ «بێ دەنگ دەبێ » قسە بکە .. «بۆ ئەوانی تر » هەمووتان واتان کرد بێمە ژوورەوە .. «کلێر بەرەو دەرگا دەچێ .. هەوڵی دەرچوون دەدا .. ری بازووی دەگرێ »
کلێر : بەرم دەن
ری : «لەسەرخۆ » تەمای چیت هەیە ئەوەشێت بووی ؟
نك : نەرۆی دەتکوژن .. پارچە پارچەت دەکەن ..
«کلێر خۆی بۆ دەرگا هەڵدەداو بای دەدا بەڵام دەرگا ناکرێتەوە .. لە دەرەوە دەنگ دەبیسترێن .. لەو دەنگانە هی ژنێك و پیاوێك »
: لەمەو دووا ناتوانی بێتە دەرەوە
: ناتوانی لە گەڵ ئێمەدا بژی
: تا ماوی هەر لە ژوورەوە دەبی « دووبارە کلێر هەوڵی دەرگا کردنەوەدەدا .. ری بازووی دەگرێ و بە دووای خۆی دەیکێشێ .. دەکەوێتە خوارەوەو دەگری »
کنیاتا : «بەترس و لەرز لە دەرگای چێشتخانەوە دێتە ژووری دەنگی دەرگای لای چەپ دێ .. بەهوی باوە دەکرێتەوەو دادەخرێ »
کلێر : « بەگریانەوە » لێرەدا مامەوە .. ئیتر دەرچوونم بۆ نیە .. «لەو کاتەی کلێر دەگری ، مەت لە دەرگای چێشتخانە دەچێتە دەرەوە ، بۆ ئەوەی ئەو ئەو دەرگایە داخا کە با دەیەژێنێ »

# نەفرین

سەعدوللا پەرۆش

١٩٨٥ ـ ١٩٨٦

ـ١ـ

پەژموردەیت ..
بەسیمای کەنەفت و بینایی کزبووتا دیارە
ئارامیت تەریوەو برینی نامۆییت تابڵێ دژوارە !
ترساویت ..
ناوێری پشتی راز بەکێوی ئاوەزێ ببەستیت
باوەرت گومانی روخانی لێ بکا .
ناوێری کەشتی دڵ بە دەریای ئەوینێ ببەخشیت
ئاوەرۆێ روو بەرەو نادیار رێ بکا .
وەك بڵێی وابەستەی رۆحێکیت
کە گەڤ مردن و مۆتەکەی نوشوستی نەتەیان بردووە
ئەوەتا چاوەرێی پێبوونی مۆمێکیت .
کە زریان لە مێژە خامۆشی کردووە .

★ ★ ★

بۆیە جارێك
گورگە تۆبەو پەژیوانی
لەبەد مەستی مەرایی‌دا ..
خوێنی دڵی دووا هەڵدانی پەیمانەت پێ دەتکێنن .!
جارێکی دی ..
مژی هەڵپەو مەگیرانی
لە کونجی دڵنیایی‌دا
ملی سوێندی دەمیان بەڵێن و پاکانەت پێ دەشکێنن .!
گوایە جارێك
خەم و جەخاری نوشوستی
سەری بە مەرگەوە قاڵت ،
سەودای تەفرەو ریا دەکەن .! .
جارێکی دی
تاسەی دەرو چۆڵ پەرستی‌ی ،
دڵی نادان و منداڵت ،
وێڵی دەشت و بەریا دەکەن .!
جارێك کۆستی خەمی پیری‌و
ترسی کۆمانەوەی پشتی داری عەشقی بەساڵداچووت
تەرمی تاسەو دڵنیاییت پێ دەنێژن .
جارێکی دی ،
کەمەندی سۆزی بەخسیری‌و ،
کەلاوەی عومری نغرۆ بووت
پەیڤی مەرگ و ماڵئاواییت لەناخی ماتەمی شیعرا ..
پێ دەبێژن .

★ ★ ★

لەو رۆژەوەی
سەری هەودای دۆزینەوەت وون کردووە
لەو رۆژەوەی
کرمی گومان ، پەی بەداری زیندو بوونەوەت بردووە .
لەو رۆژەوە ،
مۆمی ترس ،
باڵی پەپولەی نوستنی بە ئاگری شەونخونیت بەستۆتەوە
دڵنیاییش بەبێ پرس ،
بارگەی خەون و هەدادانی ،

◁

له کوێستانی ناخی گیرۆدەی دوو دڵێت گواستۆتەوە .

★ ★ ★

ئەومتا ،
ساڵەو ساڵ چوار وەرزە ،
لە رەنگدا نابینا دەنوێنێت !
ئەومتا ،
باڵەو باڵ چون تەرزە ،
لە دەنگدا خاك و خۆڵ دەنوێنێت !
هەندێ جار ،
زی خەفەت دامەنی مەزاری خەڵوەتت پێ دەگرێ
یا پەنای فریادت بۆ چاکێ پێ دەبا
کە هەرگیز مزگێنی شکانی تەلەسمی پێ نەدرێ
هەندێ جار ،
سەر دەکەی ، بەتوونی تاریك و ترکزەی بن شاخێ
ئاشکرا رەچاوی رمانی لێ بکرێ
یا ناچار مل دەنێی بەلاڕێی پێ دزەی قۆناخێ
کە ئەنجام ،
بزر بوون دەروازەی دەرچوونی لێ بگرێ !

★ ★ ★

نەتبیستووە ،
گریان ،
کە شیعری خەمباریی بۆ چاو دەڵێ
لەگەش بوونەوەی روومەتی ووشك هەڵاتوو ناگەرێ !
باران ،
کە بەیتی دڵداری بۆ ئاو دەڵێ ،
لەدەر بوونەوەی کارێزی پێدەشتی تینوو ناگەرێ
بەیان ،
کەسیحری بێداری بۆ گزنگی هەتاو دەڵێ ،
لە نساری بن کەپکەی نووستوو ناگەرێ !
خەزان ،
کە پرچی شۆرەبی لە پایزان بە با دەکا
لە پاوانی کەنەفت و ماندوو ناگەرێ ،
زستان ،
کە بەفری سەرسپی بە پرچی کوێستان دادەکا
لە گەرمێنی هەتاو سووتاندوو ناگەرێ !

★ ★ ★

وەك جاران نەماوی ،
ئەوێستا ،
دڵی مۆم لە بەزمی پەروانە دەشکێنیو
ژیلەمۆ دەکەیتە چاوی گوڵ
خوێنی باخ بەفیتی رەشەبا دەرژێنیو
ناهێڵی سەوزایی بگاتە لێوی چڵ
ئەوێستا ،
روناکی راو دەنێی ،
جریوە لە چاوی ئەستێران لێڵ دەکەی
ئاگرۆچکەی زەنوێران لە قورگی ئاو دەنێی
کۆچباران بە شوێن پێی بزر بووی هەواران وێڵ دەکەی
ئەوێستا ،
تارمایی دەبەیتە میوانی چل چرا
دارستان بە پاسی رەشەبا دەسپێری
کۆی زوخاڵ بە دەستی پریشکی ئاگرا
بە دیاری بۆ رەزو جۆخینان دەنێری
ئەوێستا ،
تۆش وەکو بایەقو ،
بەو مەرگە ناوەختە هەڵدەڵێی
باڵندەی زیندەیی بخاتە داوی تۆر
بەبەژنی ئەو زۆڵە درەختە هەڵدەڵێی
گەزافی بڵندیی لێبدا بەسەر تای پەلاشی پێدەشتی پان و پۆر
بەشکۆی ئەو تەختە هەڵدەڵێی ،
لەنگەری گرتبێ شانی کورت سەری شۆر

★ ★ ★

تۆ کامیانی ؟!
نە بناران بەشایستەی دالدەی عەشقی خۆت دەزانی
نە بەژنیشت هێندە بەرزە رۆژێ بتباتە پاڵ لوتکە
نە باڵندەی ئاسمان بەخۆیەوەت بگرێ بە میوانی
نە ئاوەڕۆشت تەلانێ پێش خۆیت دا وەکو جۆگە
تۆ کامیانی ؟!

بلێم بنار ،
دەڵێ نزمیی دەکا مردن !
بلێم لوتکە ،
دەڵێ دامێن ئارام ئامێزترە بۆمن .
پێت خۆشە لەیەك کات ،
هەم لوتکە ماڵت بێو
هەم بنار باوەشت پیا بکات ! .
پێت خۆشە وەك زەمین ،
هەم سامااڵ ساباتو یاڵت بێو
هەم باران بەریژنەی گەردی روت رابدات ! .
پێت خۆشە دیوێکت نسێ بێو دیوێکت بەرۆچکە
تاناخت هەم برکی ئاگربێو هەم تەزوی موچرکە
پێت خۆشە گەردیلەی با ئاسا بچیو بێیت ، بۆ ئاسمان بۆ زەوی
تا لەگەڵ گەرمادا باڵ بگری بۆ بەرزیو
لە دوتوێیی سەرماشدا دانەوێیت بۆ نەوی ! .
تۆ کامیانی ؟! .
هەڵبژێرە ، یا لەگەڵ دوند هەناسەدان
یا لەپاڵ بەردی ترکزە دارمان و تل بوونەوە
یالەگەڵ ئەزەلدا ژیان .
یا لە توێی چەند ساڵێ تەمەن ،
مردن و لەبیر چوونەوە ! .
هەڵبژێرە ،
یان ئا ، یان نا !
ئا ، بۆ سامانی پاش بای وەشت !
نا ، بۆ وون بوون و تەماشای دەم سەرابی پانتایی دەشت
ئا ، بۆ هەناسەی زیندەییو وەك دوند لەسەرپێ راوەستان
نا ، بۆ پیلانی مردن و گەڤ دێوی تاریکستان .

★ ★ ★

نیگەرانیت ،
بۆیە جارێك ترس و نەمان ،
هەوارت پێ دەگوازنەوە کەندرێکی لە سێرە دوور
جارێکی دی ،
موتەکەی دوو دڵیو گومان .!
رێنوماییت دەکەن بەرەو ئەو دیو سنوور .
تۆ کامیانی ؟!
نەئاویت و
نەسیماشت لە قەڵبەزی دەریا دەکا .
نە دوندی سەر بۆ بەرزی هەڵکشاویت و
نە بەژنیشت لە سەرکەشیی چیا دەکا .
چونکە چیا رازو نهێنی خۆی هەیە
بۆیە سەری ستەمدیدەی بەرەو ئاسمان هەڵبریوە !
بەلام نەکێ. ئامادەیە
روزی نهێنیی بۆ بلند رامانی خۆی بدرکێنێ .
نەدەریاش حەز دەکا عەشقی هەڵچوون و داکشانی خۆی
بتورێنێ .
ئەوەتا ،
روبارێك سەرەو خوار بێپەروا
لە زەنوێر دڵگیرەو ،
بۆ دیدەو ژوانی گەرمەسێر ، بە پێدەشت دادەروا .
بیستووشمە کازیوە ،
لە پێناو گزنگە ، جریوەی لە چاوی ئەستێران دزیوە .
دەشزانم بای خەزان ،
بۆ قژی باخ دەرنێ پایزان !

★ ★ ★

- ٢ -

بروات بێ
من کاتێ مەتەڵی خەونی خۆم هەڵێنا
کە شوێن پێی ترسی تۆم هەڵگرت و نهێنی گومانم دۆزیەوە
من کاتێ چۆلەکەی سوێندی خۆم رزگارکرد لە داوی بەڵێنا
کە مێژووو سەربردەی مەرگی تۆم بەپێتی مەرگ ومان نووسی
بۆیە زوو بەنەخشەو هزرێکی هەیاسیی
مەرگی خۆم لە پەتی مردنا داگرت و عەشقی تۆم هەڵواسی
من ئەوسا بە باران ئاشناو لە بەفریش بێ باك بووم .
زریانیش لە بەتی برایوك بیستبووم چیرۆکیو بینیبووم پێناە
بروات بێ ،
من ئەوسا لە سیمای گەواڵە ساماڵ و



لە چاوی تاریکیش مۆمێکی ڕوناك بووم .
بۆراستیش ،
جریوە گەواهیم بۆ دەداو تریفە دەمناسی .

★ ★ ★

من شەپۆلی لێوار گرتووی ،
ئەو ڕوبارەم .
دەربەند دەیدایە دەست دەربەند !
من سەهۆڵی سەرما بردووی ،
ئەو بنارەم ،
عەشق بەژنی دا بە لوتکەو تەمەنیشی بەخشی بەکەند .
بۆیە وامنی لاڵ ،
لە خۆوە زمانی زیندوویی دەزانم
بۆ بەفرو مەل دەدوێم ،
بۆیە وا منی کوێر ،
لە خۆوە چرۆی کرد درەختی ڕامانم ،
لە چاوی باخ دەڕوێم .
بۆیە وامنی شێت ،
لە خۆوە گریانی شەپۆل و موچرکی هەڵچونی ئاو فێربووم
ئەوێستا جار جارێ ،
هەنسکێ بە لێوار دەسپێرم
بۆیە وا منیی دەشت ،
لە خۆوە ، ئاوێتەی خەرەندو تاوێر بووم .
ئەوێستا ،
هەر شوێنێ تەماشام بیگاتێ بە گریان دەیدێرم .
بۆیە وا منی تاڵ ،
لە خۆوە لە شەهدی شیرینی خەم تێر بووم .
ئەوێستا ،
تیچاوی خەیاڵم ،
لە سیمای ناسکی هۆنراوە دەگێرم .
ئەوێستا ،
لە خۆوە ، بارانی هەڵبونم بەسەردا دەبارێ
لە خۆوە ڕوباری سووتانم بەناخدا ڕێ دەکا
بۆیەوا ڕەشەبای دەروونم جار جارێ ،
چرایێ دەشکێنێو چرایێ پێ دەکا .

★ ★ ★

من لێم ڕوونە ،
شێتی ئەنجامی گومان و
مەرگ مایەی بزربوونە .
شیعر دیدەی تێرامان و
عەشق نهێنی ئەزەل و تاسەر بوونە
ئەم تەلەسمە ، باران شەوێك بۆی شکاندم
بەلام دووای هەزارەها تنۆکە سوێند
ئینجا وەکو نهێنیێك بۆی درکاندم .
لەو شەوەوە ،
موچرکەیێك دەمهەژێنێو
تاسێکی قووڵ دەمباتەوە !
سۆزێکی کپ دەمگرییێنێو
خەمێك ژیرم دەکاتەوە :
لەو شەوەوە ،
ئەندێشسەیێ بۆ ژوانی شیعرم دێنێو
کۆستی گەورەی مەرگەساتێ دەمباتەوە
وەکو گەلا ، ڕەشەبایێ دەمقرتێنێو
گەواڵەیێ لە مشتێ خۆڵ دەمداتەوە
بۆیە ئێستا . وریام نەبا
نسکۆی ڕوخان و نشوستی ، جارێکی دی نەتەم ببا
ئێستا شەوان چرا دەکەم بە هاو دەمم باکم نیە لە ڕەشەبا
چونکە دەڵێن : چرا جنۆکە ڕاو دەنێو ئاگر مەترسی لادەبا

★ ★ ★

ـ ٣ ـ

دوور بڕوانە
دوو بڕوانەو بیر بکەوە لەم گەردوونە فراوانە
تابزانیت
هەرچیت دەخزێتە ناو تۆری گلێنەی چاو
لە سەرنج و ڕوانینا
چیشت بۆ ڕادەکشێ لەبەر تیشکی هەتاو
لە ئاگاهیو خەو بینینا ،

هەر لەدوندی گەردن هەلکشاوی چیا
تا دەگاتە سەرابی پشت تەم و مژی پێدەشتی پان
هەر لە قەڵبەزی زیوینی کەفی دەریا
تا دەگاتە تاوێی بلند هەڵدراوی قوبەی ئاسمان
هەر چیت بەبەر تەماشادا گوزەربکاوسەری پرس و سەرسامیتی بۆ هەڵبریت
چیشت لەبەندەری هەستی کش و ماتا لەنگەر بکاو
مەلی هزرو ئەندێشەتی بۆ هەڵفریت
هەمووی تێکرا
یا ئەو تەلەسمانەن کە هۆش بۆ زەفەری شکاندنیان ،
دەستەو یەخەی ئەم دەربەندیا ئەو تونێلە
یا ئەونهێنیانەن شیعر
سەبارەت بە درکاندنیان ،
هەمیشە کۆچەرو وێلە

★ ★ ★

دڵنیابە
شەو بێ سۆراخ لە کازیوە
گفتی کۆچ و رێ نومایی پێ نادرێ
رێگاش بێ دۆزینەوەی قۆناغ بۆ پەریوە
باری هەنگاوی رۆیین و ماڵئاوایی هەڵناگرێ
بۆ کوێ دەروێ ؟ .
چ دونیایێ ،
خۆزگەوخەونەکانی لەگەڵ ، ویستی تۆدا دێنە رایێ ! .
چ بەندەرێ ،
رۆژێ سەری دەیان شەپۆل لەپێناو خۆی ناکا بەژێر پێی لەنگەرێ !
کام دونیایە ،
ئەو دونیایەی عەشقی تێدا فەرمانرەواو
شیعری تێدا زمان و پەیرەوی خوایە
دوور نیە وەك دەڵێن وابێ ،
ئەم ژیانە لە ئەزەلدا بۆ خاتری چەند سوڵتانێ دامەزرابێ
وا نەزانی تەنیا چاوی ئەم قوژبنە خەراباتە
دیدی خەون و نیگای شیعری تێدا قاتە

بروا مەکە لەم زەمینە کونجێ هەبێ
خەم و ناسۆرو گریان و لێك دابرانی تیا نەبێ !
مێژوو دەڵێ :
نەك هەر پاشا دەرحەق گەدا
تا سروشتیش دژی مرۆڤ ،
خەریکی پیلان نانەوەو گەرای مەرگ و خەم دانانە
بەڵگەش ئەوەتا هەر ساڵێ ،
ئاو سەر بکات
چەند چیمەن و دارستانێ رادەماڵێ
یا هەر وەرزێ با هەڵبکات .
بێ سێ‌وو دوو چەند کوانووو چراخانێ خاپور دەکات .

★ ★ ★

رۆژانێك ئەم ناوەش
فرمێسکی کانیاوی ،
وەك مانگ بوو ! .
تانۆکی بەگوڵباخ رسکاوی ،
لە تاڵی برژانگ بوو .
شەوانێك ئەم ناوە
پەنگری ئاورگ و کازیوەی بەیانی
لە پرشەی تریفەو جریوەی ئەستێران گەشتر بوو
رەشماری چل کەزی ناو شانی
لە سیمای قەترانی نیوەشەو رەشتر بوو
ئەو کاتە ئەم ناوە
ئەمجارە قرچە هات
بەرلەوەی پێخوستی پێی لێمشت بزر بێ
ئاگری بەردایە دەروونی تاساوی
بەرلەوەی گلێنەی لەشێی ئاو کزربێ
کلچوکی ژیلەمۆی هەڵسوی لە پێڵوی نووساوی
شەو هات و
شەو رۆیی
رۆژ هات و
رۆژ رابورد
جێ پەنجەی خۆر وون بوو ،



بلووری گەردن و روخساری دیمەنی
لەڤینۆس شۆخ تر بوو
گزنگی بەندەن و خوساری چیمەنی
لە بەفر تۆخ تربوو
بەلام ئاخ شەوێکی سایەقەی سر ئامێز
شەوێکی کرێوەی بۆ ئارام لە پارێز
بەفر هات ،
هەلاوی کوانوی خەفە کرد
ترووسکەی فانوسی دەرخواردی زریان دا
ئاورگی زەلیلی ئەم گێژو تۆفە کرد
تریقەی نقوم کرد لە قولپی گریان دا
بەفر هات
هەیوان و دالانی داپۆشی
رێی کانیو جێژوانی لە دۆست و دلداران شاردەوە
کپی کرد هەناسەی بلوێری فرۆشی
دووا قومی پەیمانی تەمەنی خواردەوە
شەو هات و
شەو رۆیی ،
رۆژ هات و ،
رۆژ رابورد .
سایەقە سوی شکا سەرما مرد
بەفرو چوو ، پاش بەفر لافاوێ سەری کرد
لافاویش بەر لەوەی هەرەسی کەلاوە
هەلێنێ برژانگی بەلیتە نووساوی
بەرلەوەی گولزاری یاشێلی ئاژاوە
بەبادا بەرامەی هەناسەی گولاوی
لافاو هات تەوژمی لێشاوی .
وەك سەی هار بەربووە بەرماوەی کولێتی رماوی
شەو هات و
شەو رۆیی ،
رۆژ هات و
رۆژ رابورد .
ئاو هەلّی لێ هەلّساو لافاو مرد
گەرما مرد !
دووا جار سەری کرد بای خەزان
رەشەبا نووسایە تەمەنی سووتاوی
تا ئەنجام قوژبنی گۆرستان
بۆی بووە دووا مالّی تالّەمووی رژاوی

★ ★ ★

لەو ساوە
تا ئێستا لەم ناوە
نەچلّی درەختێ برژانگی گەلاوێ بۆ سێبەر هەلّدێنێ
نەمەلێك هێلانەی بێچوی خۆی دادەنێ لە پۆپێ
نەپەنجەی سرومێك جۆلانەی نەمامێ دەژێنێ
نەچەمێك فرمێسکی بۆ چیمەن دەرێژێ دلۆپێ
لەو ساوە
تا ئێستا لەم ناوە
نە شیعرو ئارامیی ، نەخەون
لەو شوێنەی دەستی تۆف بیگاتێ ناخەون
بێگومان لەم جۆرە شوێنانە
چۆلەکەی شیعرو ماچ دانانێن هێلانە
دەترسن نەوەکا
بەفر بێو بالایان وون بکا
یا خورەی لافاوێ ،
وەك بادە هەلیان دا ناکاوێ
دەترسن رەشەبای هەندەرێ
تەمەنیان یەکجاری راپێچێ
یاکلپەو هەلاوی ئاگرێ
چارۆگەی خەلوزیان لەبالا وەرپێچێ
دەترسن ئەمجارە مەرگ خۆی
مامزی ئەزەلیان بنێتە ژێر چەقۆی
وەك چۆن بلێی بیستنبێتیان
مەرگ لەدیدەی تەماشاو تێرامانا
هەلپروکان ،
لە سوێی کروزو سووتانا
مالئاوایی و پێك گەیشتن ،

له توێی دیدارو ژووانا
جارێك له قولپی گریانا
خۆ دەنوێنن !
جارێکی دی
له ختوکەی دڵ و گیانا
پێلوی عەزرەت دەتروکێنن
جارێك له دەشتی کوشتنا
گەرا دەخەن
جارێکی دی
له بەهەشتی جودایی‌و پێك گەیشتنا
فەرشی نامۆیی رادەخەن .

★ ★ ★

لەو ساوە ٤
لەوەتەی دووابزەم بەفیتی دوو دڵی کوژراوە
بە هەستم ، بۆ شیعرێ دەگەرێم ئارامی‌ی
بەوگیانە ببەخشێ ، شێتی کرد ناکامی‌ی
لەو ساوە
سەرنجی مەبەستم بۆ شیعرێك بلاوە
تروسکێك رۆشنایی
بە چاوێ ببەخشێ وێڵی کرد تەماشاو کوێری کرد گومرایی
لەو ساوە ،
تا ئێستا لەم ناوە

وەك حەلاج بێ پەروا
رێی هەستی تەی دەکەم بەشوێن پێی خودی خوا .
وەك عیسا ،
کونجی حەق تەی دەکەم
بەپشتی خاچەوە کە نیسا کە نیسا .
لەکام لای
له دەشتی ئاسمانی کام هەوار
له داوی راوچیان ئالاوی
له شەوی سامالی کام بەهار
وەك نووری ئەستێرە له چاوی ئاسماندا رژاوێ

له پۆپی کام درەخت
له کۆشی گەلادا هەڵنیشتووی
بە شوێن پێی کام بزەی شنەبا
ملی رێی تۆرانت گرتووەو رۆیشتووی
هەر جارەی
له نەغمەی دەنگێکدا
گوێم لێیە دەگریێی
له وەرزی هەرتازە بەهارێ
له خونچەی رەنگێکدا
دەتبینم دەپشکوێی ! .
بۆیە من ئەوێستا ،
بۆ لەرەی هەر دەنگێ ،
گومانم ،
ئاوازێ ... دەخوێنێ
بۆ شێوەی هەر رەنگی ،
رامانم
دیمەنی روخسارێ دەنوێنێ
دوواجار
بەپشتی رەشەبا ،
مشتێ خۆڵ هێناتی
بە دوواتا جێ کوختێ زەمینم دایە کۆڵ
ئەوێستاش ،
مەترسیم لەبەفرە
ئەوەتا مرازم بۆتە دۆڵ .
له بیرمە جارێکیش ،
لەخەندەی ساواییك تریقەت هەڵدەستا
ئەمجارەش ،
گومانم ، له خشپەی گەلایە
ئەوەتا لەتاسەت خەزانم لەدوتوێی دلایە
نەء ، ترسی ئەمجارەم لەگەڵ رمانە
بۆیەوا سەراپام نەفرین و گومانە .



# کاروانی رۆشنبیری لەکوردستاندا

## هەولێر دژوار

### نامەی ماجستێر

لە ١٥/١١/٩٨٨ لە زانکۆی صلاح الدین کۆلێژی پەروەردەدا بۆ یەکەم جارە نامەی ماجستێر بدرێتە قوتابی، نامەکە بەناونیشانی (چەند گۆرانێکی کیمیاوی پۆلی ستایرین و هەندێك لە پۆلیمەرە هاوبەشەکانی ستایرین) کە قوتابی ئازاد صدیق صدرالدین بەرزنجی بروانامەی پێوەرگرت . لە پرسیارێکماندا دەربارەی ناوەرۆکی نامەکەی مامۆستا ئازاد . لە وەلامدا بە کورتی گوتی: [ئاشکرایە کە پۆلی ستایرین ماددەیەکی پیشەسازی گرنگە لەژیانی رۆژانەماندا و بەو مەبەستەی چەند رەوشتێکی کیمیاوی‌و فیزیاوی ئەو پۆلیمەرانە بگۆرین بەرەو باشتر ئەم لێکۆلینەوەیەمان کرد بەهۆی چەند کارلێکردنێکی کیمیاویەوە لەنێوان پۆلی ستایرین و پۆلیمەرە هاوبەشەکانی لەگەڵ هەندێك بۆیاخ (الاصباغ) و ئەسیتەیتی جیوەو ببریدین و .... تاد].

ئەوەی شایانی باسە لێژنەی گفتوگۆکردنەکە لەم بەرێزانە پێك هاتبوو: د. اکرم عزیز محمد سەرۆکی لێژنەکە، د. سائد اکرم شاکر ئەندام، د. احمد عبدالحسن ئەندام .

مامۆستا ئازاد صدیق بەرزنجی لەساڵی ١٩٥٩ لەشاری سلێمانی لەدایك بووە، قوتابخانەی سەرەتایی لە قوتابخانەی (حمدی سەرەتایی) لەساڵی ١٩٧١ تەواوکردووە، هەروەها قۆناغی ناوەندی‌و دواناوەندی لە (دواناوەندی شۆرش) تەواو کردووە، لەساڵی ١٩٨١ بەپلەی (زۆرباشە) بەکالوریوسی لەزانستی کیمیا لەزانکۆی سلێمانی پێشوو (صلاح الدین)ی ئێستا وەرگرتووە .



### رەخنەی شانۆیی

یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کورد لقی هەولێر لەئێوارەی ٦/٢/٩٨٨ لەهۆڵی نەقابەی کرێکاراندا کۆرێکی بۆ رەخنەگری شانۆیی کاك حەیدەر عبدالرحمن سازدا . لەمەر شانۆگەری (سیناریۆی شانۆگەریەکی ژەهراوی) لەنووسینی پۆشکین و وەرگێرانی مامۆستا محمود زامدار و دەرهێنانی هونەرمەند کەریم عوسمان . شایەنی باسەکەوا ئەم شانۆگەریە لە بەرهەمەکانی تیپی شانۆی هونەری نوێی کوردی بوو، لەچوارچیوەی فیستڤاڵی شانۆیی هونەرمەندانی شاری هەولێر پێشکەش کرا .

کاك حیدر لەوباسەی کەوا دەربارەی ئەم شانۆگەرییە ئامادەی کردبوو، پەنجەی بۆگەلێ لایەنی‌هونەری‌و فەلسەفی شانۆگەرییەکە درێژ کردبوو. لەسەرەتادا بەدرێژی لەمەر پۆشکین و بەرهەمەکانی دووا، هەروەها ئەو گۆرانە بنەرەتیانەی

که پۆشکین له شانۆی روسیادا هێنایه کایەوه. پاشان هاته سەر شانـۆگـەری مۆزارت وسالیێری‌و بەشێوەیەکی زانستیانه گەلێ لایـەنی فەلسەفیانەی دەربارەی هەردوو کاراکتەری‌مۆزارت و سالیێری باس کرد.

دوای شیکردنەوەی هەندێ لایەنی گرنگی دەقەکە هاته سەر هۆڵی پێشکـەش کردنی شانـۆگـەریـەکەو لەشەش خاڵی سەرەکی‌دا باسی لەلایەنه ئیجابیەکانی هۆڵی شانۆیی‌کرد، وەك ئەلقەیەکی پتەوی لێك بەستنەوەی بینەر بەکاری شانۆیی.

ئینجـا کاك حیدر عبدالرحمن بەو ناوەی که له رۆژانی پرۆڤـەی شانـۆگـەریـەکـه ئامـادەبـوو، باسی لەشێـوازی مامـەڵەکـردنی دەرهێنـەر کرد لەگـەڵ ئەکتـەرداو لایـەنـه ئیـجـابیـەکـانی رێبـازی (کـرۆتـۆفسکی) روون کردەوه لەسـەربەخۆیی‌دان بەئەکتەر لەکاتی پرۆڤەکردن دا بۆ ئەوەی ئەکتـەر بەدوای باشتـرین حاڵەتی داهێنان و خۆدۆزینەوەدا بگـەرێ. هەر لەباسەکەی‌دا کاك حیدر هاته سەر (ئەکتەر له مۆزارت و سالیێری‌دا) ئەوەبـوو باسی لەگـەڵێ لایەنی هونەری هەردوو ئەکتـەرکـرد، ئینجـا هاتـه سەر دەرهێنـان و ئەم تاقی‌کردنەوە تازەیەی کەریم عوسمان و لەبواری دەرهێنان دا، باسی له دەنـگ و بێ‌دەنگی، بەکارهێنانی چرای ئەفسوناوی، رەنگ، رووناکی، جل وبەرگ و کۆمەڵه لایەنێکی‌تری هونەری.

شایـەنی باسـه کەوا لەسـەرەتای کۆڕەکەش فلیمێکی ڤیدیۆی شانۆگەری ناوبراو نیشان درا کەوا لەلایەن هونەرمەند (زهـیر عبـدالمسیـح)ەوە، گیرابـوو. لەکۆتایش دا دەرهێنەرو ئەکتـەره بەشـداربـووەکـان سەرنجی تایبەتی خۆیان لەمەڕ باسەکەو بەرهەمه شانۆییەکه دەربڕی، کۆمەڵێکیش لەنووسەرو هونـەرمـەنـدان دەمـەتـەقێیان لەسەر باسەکەی کاك حیدر عبدالرحمن کرد لەوانه هونەرمەند صباح عبدالرحمن، محسن محمد، محمد تیمور.

## حوزنی، داماو

دەزگـای رۆشنـبـیری‌و بڵاوکـردنـەوەی کوردی له ١٢ـ١٣/١٢/٩٨٨ لەهـۆڵی رۆشنبـیری جەمـاوەردا لەیادی حوزنی نەمـردا چەنـد کۆڕێکی سازکرد. لەسەرەتادا زامدار بانگی ئەم بەرێزانەی کرد بۆ مۆم هەڵگیرساندن. مامۆستا حسین رەشوانی، دکتۆر مارف خەزنەدار، مامۆستا خالص بەرزنجی، هونەرمەند طه بابان.

دوا به دوای هەڵگیرساندنی مۆمەکان هونەرمەندی لاو ئامانج غازی روانـدوزی بەئاوازێك بەنێوی خونچەی بەهارستان که یەکەم کتێبی چاپکراوی مێژوونووسی کورد حوزنی موکریانیه بەشداری ئەم یادەی کرد. ئینجا کاك محمود پارچه شیعرێکی حوزنی لەسەر ژیانی خۆی واته ژیانی حوزنی خوێندەوه. لەم یادەدا یەکەم باس لەلایەن مامۆستا مستەفا نەریمان پێشکەش کرا تێیدا باسی سەرهەڵدانی رۆژنامەگەری کوردی بەگشتی‌و دەوری حوزنی‌و پیرەمـێردی نەمـری کردو ئینجـا باسی ئەو وێچوونانەی نێوان پیرەمێردو حوزنی کرد.

دوا به دوای ئەمه هونەرمەند حمه علی حسن شیعرێکی حوزنی دامـاوی خوێندەوه، ئینجا مامۆستا حسین رەشوانی باسێکی بەم ناونیشـانەی خوارەوه پێشکەش کرد (حوزنی چ بووه؟).

باسی سێیـەمی ئەم یاده لەلایـەن مامـۆستـا ممتـاز حەیدەری رۆژنامەنووس بەناوی حوزنی قوتابخانەو گفتوگۆیەك لەگـەڵ مامـۆستـای پایـه بەرز سەعید ناکام پێشکەش کرد. کەپێشەکیەکەی‌بەم جۆره بوو [ئەم چەند دێره سادەو بە پەلەی من کەلەم یادکردنەوەیەدا پێشکەشتانی دەکەم، تەنیا هاوبەشی کردنێکی بچکۆلانەی ئەمەك داری‌یه. ئەم یادکردنەوەیه ناوی نراوەمیهـرەجانی رێزگرتن، مایەی خۆش حاڵی‌یه که بۆ جاری دووەم پاش شازده ساڵی خشت بۆ حوزنی نەمر سازدەکرێ، جاری یەکـەم له ٢٠/٩/٩٧٢ له کۆمـەڵەی رۆشنبـیرێتی‌ی کوردی لقـی هەولێر سازی‌کـرد دوا به دوای ئەمـه گوتـی [مـەسـەلەی ئەمـەکـداری‌یەکەش، خۆی لەوه دەنوێنێ وەك خوێندەوارێکی کورد لەبەر گەورەیی‌و لێهاتوویی‌و سوارچاکی حوزنی نەمر لەم میهرەجانەدا بەم نووسینه هاوبەشی دەکەم ئەمەش قەرزدانەوەیەکی ئێکجار زۆر بچکۆلانەیه دەرهەق ئەو زاته گەورەیه چونکه بەلای منەوه حوزنی لەخانەی پیاوه هەره گەورە نەمـرەکانی رێرەوی ژیانی رۆشنبیرێتی‌و نەتەوەیی کوردە لە سەرانسەری هەموو پارچەکانی کوردستان دەژمێردرێ].

دوا به دوای پێشەکی باسەکە مامۆستا ممتاز حەیدەری هاتە سەر ناوەڕۆکی باسەکەی‌و چەند نموونەیەکی کتێبی خونچەی بەهارستانی حوزنی خستە بەرچاو، ئینجا هاتە سەر ژیانی حوزنی‌و ئینجا کارەمەزنەکانی ئەو زاتەی یەك یەك ژمارد تا هاتە سەر ئەو چەند پرسیارەی کە کاك ممتاز بەر لە چوار ساڵ لە شەقلاوە لە مامۆستای زێدە خۆشەویست سەعید ناکامی کردبوو دەربارەی ئەو ماوەیەی کە مامۆستا ناکام لەکاتی خۆیدا دەگەڵ حوزنی لەزاری کرمانجی‌و چاپخانەکەی لە رواندوز کاری کردووە، تا ڕۆیشتنی لەگەڵ حوزنی نەمر بۆ شاری سلێمانی‌و چاپخانەی ژین کە لەلای پیرەمێردی نەمر مایەوە .

دوا به دوای ئەمە دکتۆر جمال ڕەشید باسێکی بەنێوی حوزنی‌و دەوری لەزانستی مێژووی میلل‌دا کە تێیدا باسی ئەو نامانەی نێوان مینورسکی‌و نیکتین و حوزنی موکریانیدا کرد .

لەئێوارەی ڕۆژی دووەمدا مامۆستا کریم شارەزا باسێکی بەناوی دەوری حوزنی موکریانی لەپێشخستنی هونەری وتاری کوردیدا پێشکەش کرد. ئینجا دکتۆر مارف خەزنەدار هاتە بەرامبەر مایکرۆفۆن بۆ ئەوەی یادی خۆی‌و ئەم زاتەبۆ ئامادەبوان بکات لەکۆتاییدا دکتۆرە کوردستان موکریانی چەند لاپەڕەیەکی یاداشتی حوزنی بۆمان خوێندەوە بەتایبەتی ئەو چەند لاپەڕەیەی کە تایبەت بوو بە کڕینی حوروفات و کاغەزی چاپ بۆ چاپخانەکەی‌و ئەو دەردەسەریەی بەسەر حوزنی داهاتووە. ئینجا برایان ئازاد موکریانی‌و دارا موکریانی چەند کۆمەڵە کتێبیکی چاپکراوی ئەم چاپخانەیە بەدیاری پێشکەش بەم بەڕێزانەیان کرد: مامۆستا مستەفا نەریمان، دکتۆر مارف خەزنەدار، مامۆستا حسین ڕەشوانی، مامۆستا کریم شارەزا، مامۆستا ممتاز حەیدەری، هونەرمەندان حمە علی حسن وئامانج ڕواندوزی .

## لەیادی دوو ساڵ دا

ئەمینداریتی گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوان لە ١٧/١٢/٩٨٨ لەهۆڵی میدیا لەیادی دوو ساڵی کۆچی هونەرمەندی چیایی خوالێخۆشبو محمد عارف جزراوی بۆ کاك ئیسماعیل گەیلانی سازکرد . ئەوەی شایانی باسە خەڵکێکی یەکجار زۆر ئامادەی ئەو یادە بوون بەدەیان کەس لەسەرپێ لە نێو هۆڵەکەدا ڕاوەستابوون بەڕێزان مامۆستا سیروان جاف سەرۆکی ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنی ناوچەی کوردستان و مامۆستا محمد پیرۆز ڕۆستەم ئەمینداری گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوان و مامۆستا محمد محی‌الدین جێگری ئەمینداری گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوان ئامادەی ئەم یادە بوون . بەر لەوەی ئاهەنگی یادکردنەوەکە دەست پێبکات دەنگی تەنبوورو لاوکی بابێ کەریم ببووە هەوێنی حەزو خۆشەویستی .

لەسەرەتای دەست پێکردندا هەروەکو جارێك کاك زامدار هاتە سەر شانۆو پێشەکیکی لەسەر محمد عارف و لاوکەکان و سەربردە کۆنەکانی نێو لاوکی ئەو هونەرمەندە پایە بەرزەی پێشکەش بەئامادەبوان کرد . دوای بە دوای ئەمە برای کۆرگێر کاك ئیسماعیل گەیلانی بەجل و بەرگێکی شەل و شەبەك هاتە شانۆو بەگوڵ و نێرگز پێشوازی ئامادەبوانی کردو هەروەها بەخێرهاتنیان. ئینجا چەند برادەرێکی خوالێخۆشبو جزراوی جامانی سەر وێنەی محمد عارفیان لادا، چەند برادەرێك نێرگزی ئەو شاخەی کە گۆڕی جزراوی لێنێژراوە لەسەر ئامادەبوانیان دابەش کرد :

دوا بە دوای ئەمە ئەم هونەرمەندانە هەریەکەو وێنەیەکی

جزراوی بە خۆیو تنبـوورەوە هەڵگـرتبوو هاتنە سەر شانۆو وتەیەکی بەپێزیان لەسەر جزراوی گووت: صالح ئامێدی، چەتۆ نەورۆز، ولی دوسکی، باقی مێڤـان ل زاخو ، ابوزید دیوانە، میران هەرکی، ئامانج رواندوزی، احمد دلۆڤان، جلال سعید کوردستانی، نجم الدین ئاوارە. ئینجا کاك ئیسماعیل گەیلانی ماوە ماوە سەربـردەو ژیـاننـامـەی جزراوی لەسـەر دەنگی بەسۆزی جزراوی دەخوێندەوە .

★ چەند گۆرانیەك لەلایەن میران هەرکی .

★ لاسـایی‌کـردنەوەی دەنگی محمد عارف جزراوی لەلایەن ابوزید دیوانە .

★ چەند گۆرانیەك لەلایەن ولی دوسکی .

★ لاسـایی‌کـردنەوەی دەنگی محمد عارف جزراوی لەلایەن صالح ئامێدی .

★ گۆرانیەك لەلایەن احمد دلۆڤان .

★ جلال سعیدو گۆرانیەك .

★ نجم الدین ئاوارەو گۆرانیەك .

★ بیرەوەریەك لەلایەن مامۆستا خالد دلێر .

بەخـۆزگـەی یادێك و ئاهەنگێکی دیکە کاك ئیسماعیل گەیلانی خواحافیزی لەئامادەبوان کرد .

## شانۆ

لەیـادی رۆژی شەهیـد تیپی نوانـدنی دوانـاوەنـدی بازرگانی کچانی هەولێر شانۆگەری (ئازارەکانی ژیان) نووسین و دەرهێـنـانی قوتـابی میـدیـا مجید باجەلانیو یاریدەدەری دەرهێنان مامۆستا سەرفراز نەقشبەندی پێشکەش کرد .

ئەوەی شایـانی باسـە خاتـوو میـدیـا زیرەکانە خۆی



خزاندبووە نێو کۆمەڵی کوردەواریو دیارخستنی لەسەر شانۆ، سەرەرای ئەمەیش دەورێکی یەکجار باشی هەبوو لەنواندن و شوێن پەنجەی لایانی هونەری دیاربوو، خۆزگەی دوارۆژێکی هونەری باشی بۆ دەخوازین .

ئەکتەرەکان بەگشتی: میدیا مجید باجەلان ـ زارا، غالیە عبدالکریم ـ حاجی، نهلە جمیل ـ زاهیر، ئاواز جلال ـ مەلا، پری عبدالله ـ مەلاژن، نازەنین عبدالله سوار ـ لەنجە، بەیان محمـدو امـیرە عزیـز ـ مردووهـەڵگـر . کچـانی قوتـابخانە کارەهونەرییەکانیان جێبەجێ کردبوو .

●



## سلێمانی ئازاد

### ● کۆڕ

### بەڕێوەبەرێتیی رۆشنبیریی جەماوەرو ئێوارە کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە

سەر لە ئێوارەی رۆژی سێ شەممە رێکەوتی ١٩٨٨/١١/٢٩ : کۆڕێکی شیعـر خوێنـدنـەوە لەلایـەن ـ بەڕێـوەبـەرێتیی رۆشنبیریی جەماوەر ـ سلێمانی ـ هوەو لە هۆڵی رۆشنبیریدا بۆ چەند شاعیرێکی لاو سازدرا .

لەم ئێـوارە کۆڕەدا کە نزیکـەی کاژێـرو نیوێکی خایاند ئەم شاعیرە لاوانە چەند پارچە شیعرێکی خۆیان خوێندەوە : (ساڵح بێچار ، محەمەد عومەر عوسمان ، سەلام مستەفا ، ئەحمەد رەزا ، هیوا قادر ، ئەمین محەمەد ، کاروان سدیق) .

سەرەتـا کاك «سـاڵح بێچـار» دەستی بە خوێندنەوەی چەند شیعرێکی خۆی کرد کە برێتی بوون لەمانە :

١ـ رێبوارێکی نامۆ ٢ـ هەرچی بام ٣ـ زیندەخەو

دوای ئەو کاك «محەمەد عومەر عوسمان»ی شاعیر کە بە سێ شیعـرو کۆپلەیـەك لە قەسیـدەیـەکی درێـژی لەم کۆڕەدا بەشـداریی کردبـوو دەستی بە خوێنـدنـەوەنـەیان کرد، سێ شیعرەکەی لە ژێر ئەم ناونیشانانەدا بوون :



